# کوشتن لە عێراق بە ژەهری سالیۆم و تراژیدیاکەی سێڕوانی نوچەی مەرگە لە کوردستان



نوسینی: سالار حەمە سوور باسیرە
ئەڵمانیای فیدرالی
٨/ ٢٠٠٠

****** پێشکەشە ******

ئەم کتێبە پێشکەشە بەو دایك و خوشکان و براکانەی کە لە تراژیدیا لە یادنەچوەکەی سیرڕوان لە مەرگە شەهید و زامدار بوون

********

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

کە کاتێك ناونیشانی ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە کە بە یەك دێڕ دەڵێت سەبارەت بەو هاووڵاتیە کوردانە نوسراوە کە بە سالێۆم کۆچی دوایییان کرد لە بەراورد کردنیدا لەگەڵ ووشەی ئەنفال و هەڵەبجە و وێران کردنی چوار هەزار دێهاتی کوردستان... بە قەوارە بچووکە و لەوانەیە لەبەر ئەو هەموو کارەساتە زۆرانەی کە ڕوو ئەدەن ئەوەندە سەرنجی هەموو مرۆڤێك ڕانەکێشێت، بەڵام لە گرنگی خۆیدا جێگای تایبەتی هەیە و تەنیا یەك نموونەیە لە سەدان کە چۆن ڕژێمی ڕەفتار فاشستەکەی بەغدا ڕێگا نەماوە بەکاری نەهێنێ بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد و بۆ لەناو بردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەم نەتەوەیە و تێکۆشەرانی.

بە خوێندنەوەی سەرجەمی کتێبەکە خوێنەر باشتر لەو ڕاستیە دەگات کە بە غەدر کوشتن و بە ئازارەوە مردنی تەنانەت مرۆڤێکیش کەسێکی بە ویژدان چەندە دەخاتە جیهانی بیرکردنەوە لە چارەنوسی نەتەوەیەکی چەند ملیۆنی و ئەو بیروهۆشەی کە مرۆڤ لە ڕاستیدا لە دایك نەبوە بۆ ئەوەی کە بکوژرێت، و یان ئەشکەنجە و ئازار بدرێت. کە مرۆڤێکی تر ئەو مافە بدات بە خۆی ژیانی مرۆڤێکی تر لەسەر ڕووی ئەم زەمینە بۆ هەمیشە بکوژێنێتەوە. بەڵام ئەم دیاردەیەش دیارە لە خۆیەوە دروست نەبوە. گەڕان بە شوێن هۆکانیدا و تێگەیشتن لێی گرنگ و پێویستە. بەڵێ مرۆڤ دەبێت لە ڕاستیدا عونسرێکی پیرۆز بێت لە ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا کە ئەرك و مافیشی هەیە. پێویستە هەموو مرۆڤێکی کورد لە جێی خۆیەوە هەستێت بەم ئەرکە پیرۆز و مێژووییە و لە ژیان و بیرەوەری خۆیەوە دەست

پێبكات، و جگە لەوەش هەست بە ئازار و غەمگینیی هاومرۆڤ و هاوولاتیەكەی بكات كە لەوانەیشە سبەینێ بەسەرهاتێكی لەم جۆرەش لە وولاتێكی وەك عێراق و لە ژێر سایەی ئەو جۆرە رژێمە رێگا بە خۆیشی بگرێت. ئایا ئەو مرۆڤە ئەو كاتە چۆن بیر دەكاتەوە و چاوەڕێی چی دەكات لە هاومرۆڤ و كۆمەڵگاكەی؟

كاتێك لە ناوەڕۆكی بەسەرهات و تراژیدیا و ئەنجام و لێكۆلینەوەی ناو كتێبەكە دەگەیت، ئەگەر سەرجەمی هەموو كتێبەكە نخوێنیتەوە.
ژیان دەبێت وەك شتێكی پیرۆز رەفتار بكرێت. بەلام لێكۆلینەوەی ئەوە گرنگە كە بزانین دیاردەی بوونی كوشتن و لەناو بردن و زۆر جاریش حەز پێكردن لێی لە مرۆڤ دا بۆچی هەیە؟
بۆ ئێمەی كورد هەر بە هەمان شێوە پێویستیەكی گرنگ و ژیانییە كە بكۆلینەوە لە هۆكانی دیاردەی شەڕ و كوشتن و وێرانی و برسێتی و دەربەدەری و بوونی دیاردەی شۆڕشگێڕیەت و ئازادی خوازیی وە هەروەها خیانەتكاری و هەموو ئەو ئەنجامە كۆمەلایەتی و ئابوری و دەرونی و مرۆڤیانەی كە لێی دەوەشێنەوە، تا بە هۆیەوە بتوانین رێگای ڕاست بدۆزینەوە بۆ بەدیهێنانی كۆمەڵگایەكی ئاشتیخواز و مەدەنی و یەكسان و دادپەروەر، بچەنگێین و ئەو فاكتەرانە نەهێلین كە دەبنە هۆی دروستبوونی دیاردە پڕ مەترسی و خراپەكان.
من قەناعەتم وا نیە كە هیچ مرۆڤێك هەر لە سەرەتای ژیان و لە دایك بونیەوە وەك كەسێكی خراپ دروست بووبێت، نەخێر هەمووی باش و بێ گوناه دێتە سەر ژیانی ئەم ڕووی زەمینە.

نـه مـرۆڤ كـوژه وه نـه شۆڕشـگێڕه. مانـای بـۆ گەیشـتن بـه ئەنجامێكی لۆجیك و زانستانه دەبێت به شوێن هۆكان دا بگەڕێین و یەكێك لەو سەرچاوه گرنگانه بۆ دۆزینـەوەی هۆكـان نـاو ئـەو كۆمەڵگایه خۆیەتی...

ئەو مرۆڤانەی كه من لەم كتێبەدا بەسەرهاتەكانیانم باس كردون نمونەیەكی زیندوه بۆ هەولی تێگەیشتن لەو بیروڕایەی كه پێشتر ئاماژەم بۆ كردوه.

بەڵێ هـەموو یـەكێك لـەم ڕوداوه تراژیدیا كـەم وێنانـه دەبێـت بـۆ مێژوو بنوسرێنەوه، و بۆ نـەوەكانی داهـاتووش بمێنـن، كـه لـه مێـژووی دوارۆژدا نـەك هـەر بـه تـەنیا هـەموو ئـەو تـاوان و سیاسەتی قڕكردنه بۆ نەوەكان به یاد بهێنرێنەوه كه بەرامبەر به مرۆڤەكانی سەر خاكی كورد به تایبەت له لایەن ڕژێمی سەدام حسێنەوه ڕەفتـار كـراوه، بـەڵكو بشـزانرێت كـه ڕزگـار بوونـی نەتەوەی كورد و پاراستنی كەرامەتی مرۆڤ له خۆیەوه نەبووه و ئەو تێكۆشەرانەی كه لێرەدا ناوم هێناون وەك تەنیا بەشێك له سـەرجەمی تێكۆشـەران كـه چـەندە كوێـرەوەری و ئەشكەنجەوئازاری گیانی و دەرونیی و خەباتی قورسیان بۆ ئەم مەبەسته پیرۆز و نەتەوەییه بینیوه. هەر بۆیه یه هەمان شێوەش پێویسته كه دادپەروەری له خۆشمانەوه هەمیشه سەرچاوه بگرێت و زوو ڕۆژانـی ڕەش ومێژوومـان لـه یـاد نـەچێت و هەسـت بـه كوێرەوەری و برسیەتی و ناخۆشی مرۆڤـەكانی تریش بكـەین و به هەمان دیدو لێكۆلینەوه بڕوانینه كێشەكانیان.

ئەم ئەركه مێژوییەش له نوسینەوه و بڵاو كردنـەوەی تراژیدیـاو بەسـەرهاتەكان ئەمڕۆكه زیاتر بـه هـۆی بوونـی توانـای تـەكنیكی ئـەم سـەردەمه باشـتر دێتـه دی. چـەند جێـی داخـه كـه زۆربـەی

ڕووداو و بەسەرهاتەکانی دەیان و سەدان ساڵانی پێش ئێستەمان بە هۆی نەبوونی ئەم توانای سەردەمەوە، یان لەبەر نەبونی کەسانی ڕۆشنبیر و لە خۆبردوەوە نەنوسراونەتەوە. ئاخۆ دەبێت لە مێژووی کورددا هەر بۆ نمونە چەند تراژیدیا وەك هاوشێوەی ئەنفال ڕووی دابێت و لە مێژوودا وون بوە.

هیوا بەوە دەخوازم کە ڕۆژێك بێت لە بری تەرخان کردنی کات بۆ نوسینەوەی باسی تراژیدیا و بابەتی هەست و دل بریندار کردن، بتوانین کات و بیر و هۆشمان بۆ لێکۆلینەوە بۆ بابەتی زانستانە و شارستانیەت و تەکنەلۆژیا و زۆری تر تەرخان بکەین بۆ پێشکەوتنی کۆمەلگای خۆشمان و خزمەتی مرۆڤایەتی. بەلام بێ بوونی سەربەخۆیی و دەسەلاتی نەتەوەیی و کیان و ئابوری ئەم پرۆژەیە خەونە. بۆ بەدیهێنانی ئەم خەونە دەبێت جاری تێبکۆشین و هەتا زوتر بیهێنینە دی زووتر دەگەینە پێشکەوتن و کەمتریش زیان بەخش دەبین و تراژیدیای وەك سێروانی ناوچەی مەرگە و هەلەبجە و ئەنفال ڕونادەنەوە و ئەو کاتە ئەم بەسەرهاتانەی ئێستە تەنیا دەچنە کتێبی مێژوەوە...

ئەم جەنگاوەرانە وازیان لە ژیانی شارو مال و گەرمی و خۆشەویستی مال و مندال و کەس و کار هێنا و بۆ ئامانجێکی بەرز ڕێگای گوند و دۆل و شاخە عاسیەکانی کوردستانیان گرتە بەر، بە دەیان زستان و هاوین و گەرماو سەرمایان هاتە ڕێگا بەو هیوایەی کە ژیانێکی ئازادی و بە کەرامەت بۆ نەتەوەکەیان و بۆخۆشیان بهێننە دی، نیشانی دوژمنی سەرسەختی بدەن کە ئێمە ماوین و هەین و تێدەکۆشین بۆ گەل و

خاکی خۆمان و ئێمە ئەو نەتەوەیە نین کە لە مێژوودا بتوانرێت سەرمان پێدانەوێنرێت و ئامادەی قوربانین.

بەڵێ ئەو تێکۆشەرانەی کە لەم کتێبەدا بەسەرهاتەکانیان دەگێڕمەوە لە گۆڕەپانی شەڕدا شەهید و بریندار نەبوون، بە دیلی نەگیران و لە زیندانەکانی کرکوك و موسل دا لە سێدارە نەدران و بە گولله خوێنیان نەڕژێنرا، بەڵکو ژەهر خوارد کران. ژەهرخوارد کران لە شاخ و دێهاتێکی کوردستان کە دوژمن نەیدەتوانی دەستی بیانگاتێ و خەوی بۆ لەناو بردنیان دەبینی. بەڵام شەهیدن. بە دەستی کەسێك شەهید و زامدار کران کە بە هەمان زمان قسەی کردوە و بڕوای پێ بەخشراوە و خەڵکی ئەو کوردستانە بوە و هەوای ئەو خاکەی هەڵمژیوە و خێزانی پێشمەرگە بوە.

لێرەدا چەند ووشەیەك لە دوا دێڕەکانی نامەکەی شەهیدی نەمری گەل و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەبو بەکر نوری قادر (ئاشتی) لە زیندانی فاشیستەکانەوە بە یاد دێنمەوە کە دەڵێت:

" ژیان خۆشە، بەڵام مردن لە پێناوی گەل دا خۆشترە. مردن لە پێناوی
دروست کردنی ژیاندا، ژیانە. من کە ژیانم خۆش دەوێ، مانای وا نیە کە خۆمان
دەدەین بە کوشت ژیان هەر هیچ ناهێنێت، بەڵام ژیان هێندە خۆشە بۆیە بۆ ژیان
هەزاران گیانیان دەکەنە قوربانی. هەر مرۆڤێکیش ڕێگای خەباتی گرت، دەبێ

ڕوون و ئاشکرا بێت لە لای کە بە هۆی لێبوردنی ئەوەوە لە
ژیان و ژیانی
خۆی، هەزاران دەگەنە ئاوات".

ئەم شەهیدە نەمرانەی وەك ئەبو بەکر نوری قادر نمونەی بە وەفایی و ئازایی و لە خۆبوردوییین بۆ هەمووان و دەهێنێت لەسەر ئەم ڕێبازە پەرە بە خەبات بدەین بۆ ژیانێکی ئاسودە و سەر بەرزی.
بە داخێکی زۆریشەوە کە زۆر جار لە مێژودا وا بوە کە لەسەر حیسابی ژیان و تێکۆشانی هەزاران مرۆڤی لە خۆبوردو هەزارانی تریش کە شایستەی ئەوە نەبوون گەیشتون بە ئامانج و بەرژەوەندی تایبەت و پایە بلندی خۆیان. بۆیە گرنگە و پێویستە هەمیشە سەرنج بدرێتە سروشت و گەشەکردنی بزوتنەوەکە و باڵەوانانە ئەو ئامانجە پیرۆزانەی بپارێزرێن و جێبەجێ بکرێن کە بزوتنەوەکەی لەسەر دارێژراوە و پەیوەندی بە چارەنوسی نەتەوەکەوە هەیە کە زۆربەی زۆری ڕەشوڕوت و ڕەنجدەرو بێ مافن، بۆ ئەوەی خوێن و ئازاری ئەو شەهید و تێکۆشەرانە وون نەبن و بۆ هەمیشە ئاڵای ئەو مێژووە هەر بەرز و شەکاوە بێت.

گرنگە کە هەست بە ئازاری ئەو مرۆڤانە بکرێت. هەست بەو سات و چرکانەی پێش شەهید بونیان بکرێت کە لەوانەیە ئێمەش بە هۆی ئەو بارودۆخەوە یەکێك بوینایە لەوانە. هەست بەو ئەنجامانە بکەین و سەرنجیان بدەینێ کە دوای ڕوداوەکە بۆ بریندارەکان و کەس و کارو هاوڕێکانیان جێماون. ئاخۆ دەبێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چەند سەدان ملیۆن مرۆڤ لە منداڵ و

ئافرەت و پیرو پەککەوتە و جەنگاوەرانی ئەم مێژووە بە درندەترین شێوە ئەشکەنجە و ئازار درابن و کەسیش مافی ئەسەندون و بۆ هەمیشە وون بوون لەم مێژوە جوانەی مرۆڤایەتیدا. چەند ملیارد جار کەرامەتی مرۆڤ شکێندراوە. ئەی چەند ملیارد مرۆڤ هەتا ئێستە ژیانیان بەهۆی برسێتی و کەمدەرامەتی و نا عەدالەتیەوە و بە ئازارەوە بردۆتە سەر و لە دەست داوە بێ ئەوەی یەك چرکەش بەندیخانە و شێوەی تری لەم جۆرەیان بینیبێت. ئەم جۆرە بەسەرهاتانەش هەر دوبارە هۆی خۆی هەیە و نابێت ئەوانە و هەست و ئازاری دەرونی و گیانییان لە یاد بکرێن و بخرێنە قالبی سادەی بەسەرهاتێکی سادەو گشتی ژیانەوە. بۆیە دەبێت بزانین بۆچی و بۆ کێ و چۆن تێدەکۆشین بۆ گۆڕینی یاساکانی ژیان و کۆمەڵی کوردەواری کە بەشێکە لە بنەماڵەی مرۆڤایەتی ئەم سەر زەمینە.

لە مێژوودا زۆر جار واش بوە کە پارت و بزوتنەوەیەکی ئازادیخواز لە چەوساوەوە لەبەر چەند فاکتەرێك بوەتە چەوسێنەر، بەلام هیچ مرۆڤێك کۆت و زنجیری کۆیلایەتی و چەوساندنەوە هەتا سەر قبول ناکات، ئیتر سەر بە هەر چین و توێژێکی کۆمەلایەتی یان ئاینی بێت و لە دژی ڕادەپەڕێت. ئەگەر ئەمیش بوە چەوسێنەر دوبارە چەوساوەکانی تر لە دژی ڕادەپەڕن و بەم شێوەیە مرۆڤایەتی لە مێژووی خۆیدا بە تەجروبە و پرۆسەی خۆیدا دەڕوات.

بە باس کردنی ڕوداوەکە و بە سزا دانی گوناهبارەکە ئەم چیرۆکە تراژیدیایە کۆتایی نایەت. دوبارە ئاماژەی بۆ دەکەمەوە

که دەبێت لە هۆکانی بکۆڵینەوە، لە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، دەرونی، مرۆڤی، کولتوری و ئابوری و ئاینی...

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە کتێبەکە کەموکورتی خۆی دەبێت هەر بۆ نمونە پێویستە لە ژیان و قۆناغی ژیانی منداڵی و ڕۆشنبیری و پەروەردە و ئەو بیئەیەی، هەر بۆنمونەی باسەکەمان کە ئەم ژنە کوردە نەرمین حەوێز بکۆڵمەوە کە بە هۆی ڕەفتاری ئەوەوە ئەم بەسەرهات و چیرۆکە ئازاراویەی بۆ ئەو کسانە پێکهێنا، و جگە لەوەش ژیانی لاوێتی خۆیشی لە ناو برد و منداڵی بێ دایك و باوك کرد کە نوقسانیەکی بە لایەنی کەمەوە دەرونییان تێدا دروست دەبێت کە لەوانەیە ڕق و کین و هەستی تۆڵە سەندنەوەیان تێدا دروست بکات و ڕقیان لە مرۆڤ و کۆمەڵگاش بێت بگرە لە خۆشیان.
سەدام حسێن لەم وولاتی عێراقەدا کە بە زۆر سەرۆکایەتی دەکات نمونەیەکی بە نرخە بۆ تێگەیشتن لەم دیاردەیە و من لە تەرجومەی کتێبەکەی لەتیف یەحیادا وەك هاوشێوەکەی عدی لە بەشێکدا لێکۆلینەوەیەکی لەم هاوشێوەی بابەتەم دەربارە کردوە.

من لە گەڕانەوەمدا بۆ کوردستان ڕێگای ئێرانم گرتە بەر و پێشەکی چوومە ڕۆژهەلاتی کوردستان بۆ شاری مەهاباد کە دایکی خۆشەویستمی لێ بە خاك سپێردراوە. ئەمیش بە مردنێکی تراژیدیا کۆچی دوایی کرد و جێی هێشتین. ئەو خەو و هیوایەی کە هی هەموو خێزانەکە بوو کە لە دوای چەندین ساڵی دوورە وولات بە یەکتر شاد ببینەوە بۆ هەمیشە چوە ژێر گل. ڕژێمی سەدام حسێن سەرجەم کەسوکارمی لە عێراق دەرکرد بۆ ئێران و

توشی ژیانی نارەحەتی و ترازیدیای خێزانیش بووین و ئەمڕۆکە لە چەند وولاتێکی ئەوروپا گیرساوینەتەوە.

لەوێوە گەڕامەوە بۆ باشوری کوردستان، لە کوردستانەوە بۆ کوردستان. لە وولاتەوە بۆ وولات. لە گۆڕستانی دایکێکی خۆشەویست بۆ گۆڕستانی دایکێکی تری خۆشەویستی نەتەوەی کورد، دایکی کاك مستەفا چاوڕەش لە سێڕوان لە ناوچەی مەرگە. بەڵێ دایك خۆشەویستە و دەبێت هەست بە ئازاری کەس و کاری شەهیدان و هەموو ئەو مرۆڤانە بکەین کە بە هەر هۆیەك بوە خۆشەویستی خۆیان بۆ هەمیشە لە دەست داوە و دایك و کەس و کاری ئەوانە هی هەموانە.
هەموو مرۆڤێکی کورد مێژویەك و بیرەوەریەکی خۆی هەیە و زۆربەی زۆریشیان هەر بریتین لە مێژووی کوێرەوەری، ئیتر کەمتر یان زۆرتر.

ئەم کتێبەی بەردەستت هەموو ئەو شتانەی تێدا نیە کە من ویستومە بیان نوسمەوە. هەروەك پێشتر ئاماژەم بۆ کرد بێ کەم و کورتی نیە و بە هیوای ئەوەی کە لە چاپی داهاتودا بەو شێوەیە تەواوی بکەم کە خۆم ویستومە. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت دوبارە لە کوردستان بم.

من بەشێکی گەورەی کتێبەکەم لە ئەڵمانیا نوسیوەتەوە، و بۆ ئەم مەبەستە هەر لێرەوە پەیوەندیم بە بەشێکی ئەو هاوڕێیانەوە کردوە بۆ کۆکردنەوەی مێژووی ڕوداوەکە. بەشێکی تری گرنگی لێکۆڵینەوەی ترازیدیاکەشم لە گەڕانەوەم بۆ کوردستان لە مانگی ۱۹۹۹/۱۰ بە ئەنجام گەیاندوە. هەر لەو مانگی ناوبراوەدا

لەگەڵ کاك مستەفا چاورەش و خێزانەکەی سەردانێکی ناوچەی ڕوداوەکەمان کرد، و هەندێ لە کەسوکاری ئەو شەهیدانەشم بینی لە دێی مەرگە. بۆ من وەك کەسێك کە زیاتر لە نیوەی تەمەنی دور لە کوردستانەوە ژیاوە و دوور بوە لەم ڕوداوانە و بزوتنەوەکە و پارتەکانم پێشتر هەر لەسەر کاغەز ناسیوە زۆر گرنگ بوو ج لە ڕووی تێگەیشتنی جوگرافی ناوچەکە و خستنە بەر چاوی خۆم لە شێوەی ڕوداوەکە و ژیانی جوتیاران و پێشمەرگایەتی و ناوچەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتە کوردیەکانی کەش، و دێهات و ژیان و پەیوەندی خەڵکی گوندەکان بە یەکتر و بە بزوتنەوەکەوە و زۆری تریش سەرنج بدەم.

هەندێ لە وێنەی ناوچەکە کە تۆمارم کردبوون و ئەو سەرنج و زانیاریانەی ترم لە کوردستان لەگەڵ خۆم هێنایەوە بۆ ئەڵمانیا، و ئیتر تەمویست لەوە زیاتر ئەم نوسینە دوا نخەم و لە سەرەتای مانگی ٨/٢٠٠٠ ناردمەوە بۆ کوردستان بەم شێوەیەی ئێستەی بۆ بە چاپ گەیاندنی.

سالار حەمە سوور باسیرە ئەڵمانیای فیدەرالی

********

## (١)
## بەعسیە فاشستەکان

کاتیك بەعسیە فاشستەکانی عیراق، کومونیست وشیعەیان
دەگرت و
دەکوشت ، من بێ دەنگ بووم،
خو من نە کومونیست بووم نە شیعە

کاتیك ئاسوری وتورکومانیان دەگرت و دەبرد، من بێ دەنگ
بووم، من
نە ئاسوری بووم نە تورکومان.

کاتیك ئەندامان ودوستانی یەکێك لە پارت و گروپە سیاسیە
کوردیەکانیان دەگرت وئەشکەنجە وئازار دەداو دەکوشت، من
نارِەزایم دەرنەبڕی
من نە ئەندام وە نە دۆستی یەکێك لەمانە بووم

کاتیك عەرەب وکوردە بە ڕەگەز ئێرانیەکانیان لە عێراق
دەگرت ودەردەکرد،
لەو وولاتەی کە تیایدا لە دایك بوون وگەورە بوون... من بێ
دەنگ بووم
و نارِەزایم دەرنەبڕی
خو ئەمانە هیچی پەیوەندی بە منەوە نەبوو

کاتیك دەیان هەزار هاوولاتی کوردیان ئەنفال کرد و بە
غازی ژەهراوی

خنکێندران و ژەهر خوارد کران و نیازی لە ناو بردنی گەلێکیان
هەبوو، من بێ دەنگ بووم
وسەری خۆم کز گرتبوو.

کە کاتێك هاتن ومنیشیان برد، کەس نەمابوو کە
نارەزایی خۆی لە دژیان دەربڕێت.

*****************

ئەم فکرەیەم لە نوسەری ئەڵمانی Martin Niemo وەرگرتوە کە شتێکی لەم
بابەتەی لە زەمەنی نازیە هیتلەریەکان بو سەردەمی ئەو کاتەی ئەڵمانیا
نوسیبوو - نوسەر

# (٢)
# ئەی خاکی سەوز

ئەی خاکی کوردستان. ئەی ئەو خاکەی بستێکت تەواوە بۆمبای دوژمنی بەر نەکەوتبێ، ئەی ئەو خاکەی بە خاکی سەوز ناسراویت و دوژمنان دەیانەوێت بتسووتێنن، وەك ڕووی خۆیان ڕەشت کەن. ئەمجارەش چەند ڕۆڵەیەکی ترت بێ دەسپێرین، باوەشی خۆتی بۆ بکەرەوە و مەیەڵە تا دەگاتە کاروانی هاوڕێکانی خوێنەکەی بمەێت.

سەرکەوتنمان لە جنگدایە. سەرکەوتنمان لە جنگدایە، چوونکە خاوەنی ڕۆڵەی زۆری بەوەفاین. بیروباوەڕمان مەشخەڵی سەرکەوتنمانە، چونکە ئەو مرۆڤە بە وەفاو بە ڕاستی خەباتگێڕانە لە فکر و کرداردا هاوڕێمانن، و تا ئەو بیروفکر و پاکیەش بمێنێ ناوی بەرزی شۆڕشی کوردایەتی و عەدالەت دەمێنێ.

ئەوانە دوایین شەهیدمان نین. بەڵام شەهید بوونی پێشمەرگەیەکی ئازاو دڵسۆز و نیشتمان و مرۆڤ خۆشەویست هەنگاوێکە،و پلەیەکی ترمانە بۆ دوایین سەرکەوتن.

بەڵکو دەنگی زوڵاڵی پێشمەرگە و ئەو شەهیدانە ئەوانەش بجوڵێنێت کە دوورەپەرێز و پەردەی بێدەنگیان داوە بەسەر خۆیاندا.

" کاتێك ئەم ڕێگایەم هەڵبژارد بۆ خۆم زۆر باش دەمزانی ئەم ڕێگایە سەخت و پڕ لە هەڵدێرو نشێوە. پڕ لە تەنگ و چەڵەمەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاك دەزانم سەرکەوتنمان ڕاستیەکە و لە دەستدایە. ئێمە تۆومان چاندوە و ڕەگی داکوتاوە لە خاکمان دا. زۆر باش دەزانم چیمان چاندوە و چیش دەدرووینەوە".
(شەهید جەماله ڕەش لە نامەیەکی ژووری سێدارەی موسڵەوە)

ئاخۆ هەتا کەی و چەند سەد هەزار کۆرپەی تری ئەم نەتەوەیە بە ڕێ بکەین بۆ ئازادی، بۆ نان و سەربەستی، ئاخۆ دڵی چەند سەد هەزار دایك و باوك بە ئازارەوە بمرێت، و چەند ملیۆن جاری تر ئەم خاکە فرمێسك قوت بداتە ناخی خۆی...

هەر بە هۆی زروفەوە ئەو منداڵەی گەورە بوە هەستی نەتەوایەتی
و تینوێتی بۆ ئازادی تێدا دروست دەبێت، بەڵام هەست و بیری تۆڵەیشی تێدا پێك دێت و ئەمیش دوبارە دڵی چەندین دایك و باوك و خوشك و برای تر بۆ هەمیشە بریندار دەکات... با بۆ کێشەیەکی عەدالەتیش بجەنگێت.
گەر بکرێت دژی جەنگ بین، دژی شەڕو و خوێن ڕشتن و وێرانی و دڵ بریندار کردنی یەکتر و کولاننەوەی برینەکانی یەکتر بین، بۆ برایەتی و ئاشتی و یەکسانی نێوان نەتەوەی خۆمان و نەتەوەکانی تر بین. تێبکۆشین بۆ ئەوەی لە ژیاندا یاسای مەدەنیەت و شارستانیەت و ڕۆشنبیریەت بگرینەبەر، و ئاوات بەوەش بخوازین کە تەنانەت دوژمنەکەشت هەندێ ڕۆشنبیر بیر هەتا بتوانیت قسەی وتووێژی لەگەڵ بکەیت.

## (٣)
## ڕوداوەکەی سێڕوان لە مەرگە

کێ هەیە نەیبیستبێ کە چۆن لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٧ ڕژێمی سەدام حسێن بە هۆی جاسوسێکی ئافرەتی کوردەوە (نەرمین حەوێز) لە ماڵی کاك مستەفا چاو ڕەش (مستەفا قادر محمود) لە مەرگە مادەی سالیۆمی کردبوە ناو ماستاوەوە بۆیان و لە ئەنجامی ئەم ڕەفتارە کاك بێستونی مەلا عومەر (پێشمەرگە و کادری یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لە کاتژمێری سێ و خوشکە سریعەی مەلا محرم کچی ئیمام جومعەی مەرگە لە کاتژمێری چوار و خوشکە خدیجە حسێن ئەمین، دایکی کاك مستەفا لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا لە کاتژمێری ١٠ ی شەو گیانی پاکیان سپارد بە خاکی کوردستان.

ئەوانەی کە دوبارە چاك بونەوە بریتی بوون لە: کاك مستەفا چاو ڕەش، دوکتۆر محمود علی عوسمان، کاك عدنان مفتی،

کاك سامی شۆڕش، کاك ئاواتی وەستا محمود، خوشکە تریفە سعید محمد خوشکەزای کاك مستەفا لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا و دوکتۆر شوان لێپرسراوی تەندروستی ئەو کاتەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
کاتژمێرێك دوای نان خواردن لە دەوروبەری یەکی پاش نیوەڕۆ پیاوان بەرەو گۆڕستانی مەرگە ئەکەونە ڕێ بۆ ناشتنی تەرمی دوو شەهید. دوای ئەوەی لەوێ دەگەڕێنەوە کوتوپڕ بارودۆخی کاك بێستونی مەلا عومەر تێك دەچێت. هاوار دەکات " ناتان بینم، ناتان ناسمەوە، دەستم، قاچم، دڵم... دەم و چاوی زەرد هەڵدەگەڕێ. دەیبەنە خەستەخانەی شۆڕش و وا لێکی ئەدەنەوە کە سەدمەی دڵ بێت. بارودۆخی بەرەو خراپتر دەڕوات، دوای ئەوە توشی شەلەل دەبێت. لە کاتژمێری سێ ی پاش نیوەڕۆ هەڤاڵی تێکۆشەر کاك بێستونی مەلا عومەریش شەهید دەبێت و ئەمیش گیانی پاکی بە کورد و کوردستان دەسپێرێ.

تا ئەم کاتەش نەیان دەزانی کە هۆی تەواوی مردنەکەی چیە. لە هەمان کاتدا لە ناو چوار ئافرەتەکانی ئەوێ کە نانی نیوەڕۆیان ئامادە کردبوو، خوشکە سریعە محرەم یەکەم کەس دەبێت کە ئەم زەهرە کاری تێ دەکات و دەبرێتە خەستەخانەی شۆڕش. خوشکە سریعە توشی هەمان دیاردەکانی کاك بێستون دەبێت.
خوشکە سریعەش بە تەمەنی ٢٨ ساڵی لە کاتژمێری چواری بەیانی شەهید دەبێت. خوشکە خدیجە حسێن بش، دایکی کاك مستەفا توشی هەمان دیاردە دەبێت.
لێرە بە دواوە دەکەونە ئەوەی کە گومان دروست بکەن. لە ڕۆژی دوای ئەوە دوبارە بەرەو گۆڕستانەکەی مەرگە دەکەونەوە ڕێ و ٣ شەهیدی تر دەخەنەوە ژێر گڵ. یەکەم کەس کاك مستەفا

چاوڕەش هەست بەم شتە خەتەرناکە دەکات. بە دوای ئەمان دا زەهرەکە کار لە کاک عدنان موفتی دەکات و دوای ئەو لە کاک سامی شۆڕش. کاک عدنان موفتی باسی دەکات و دەڵێت:

" ئەرەق بە گیانم دا دەهاتە خوارێ، لەسەری پەنجەکانم دا هەستم نەمابوو، دەستەکانم و قاچەکانم وابوون وەك لە کار کەوتبن ".

ئیتر لێرە بە دواوە سەرنجی تەواویان هەبوو کە دەزانن چی ڕووی داوە. لە ١٩٨٧/١١/١٠ دوو هەفتە بەر لەوە لە ماڵی نەرمین حەوێز ماستاویان خواردبووەوە، و هەموویان دوای ئەوە هەستیان بە ناخۆشیەك کردبوو لە خۆیان دا. بەڵام ئەم جارە تەئسیری زەهرەکە بەهێزتر بوو. نەرمین حەوێز دەبێت شتێکی کردبێتە ناو ماستاوەکەوە. دەمێك بوو ئەو پرسیارەیان لە خۆیان دەکرد کە چۆن مێردەکەی نەرمین دەتوانێت لە دوای دوو ساڵ زیندانی بەربدرێت؟
گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە نەرمین حەوێز لەگەڵ دامودەزگای موخابەراتی عێراقی ڕێککەوتوە کە مێردەکەی ئازاد بکەن و بەرامبەر ئەمەش نەرمینیش کارێکی چەردەییان بۆ بکات. ژیانی ئەم هەڤاڵانە لەم کاتەدا زۆر زیاتر لە مەترسیدا بوە وەك لە مەترسی ڕاستەوخۆی ڕژێم لە سەریان. ئەم هەڤاڵانە ئەندامانی سەرکردە و لێپرسراوانی عەسکەری و سیاسی و کادرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی سۆشسیالیستی کوردستان بوون و پێشمەرگەی بە وەفاو دلسۆزی نەتەوەکەمان بوون.

له ڕۆژانی دوای ئەوە جگە لە تەرمین هەموو ئەوانەی کە بۆ نان خواردن لەوێ بوون نەخۆش کەوتن. پێنج لەم هەڤالانە لە کوردستانەوە گەیەندرانە ئێران بە هیوای ڕزگار کردنی ژیانیان لە مردن. لە تاران دوای فەحس کردنی خوێنیان لە لایەن دوکتۆری شارەزاوە مادەیەکی کیمیاوییان تیا دۆزیەوە کە بێ بۆن و بێ تامە: سالیۆم.

سالیۆم وەك زەهر بۆ کوشتنی مشك بەکار دەهێنرێ. ڕێکخراوی ئەمنستی ئینتەرنەشنال ٣ لەم هەڤالانەی بە فرۆکە بردە لەندەن بۆ چارەسەر کردنیان. قسەکەرێکی ڕەسمیی بەریتانی بۆ گۆڤاری ناسراوی هەفتانەی ئەڵمانی (Stern) لە بەرواری ١٩٨٨/٢/٤ باس کردبوو کە: " دەمانویست ئەم نەخۆشانەمان لێرە لابێت تا جارێك بتوانین ئەم وەزعیەتە بە ڕەسمی وە بە بەڵگەنامەوە تۆمار بکەین." بە پێی زانیاریەکانی amnesti international لە ساڵی ١٩٨٧ بە لایەنی کەمەوە ٤٠ ئۆپۆزیسیۆنی کورد لە عێراق لە لایەن ڕژێمی بەغداوە ژەهر خوارد کراون.

ئەم زەهر خوارد کردنە تەنیا جار نەبوو کە ڕژێمی سەدام حسێن لە کوردستانی عێراق بەکاری هێنا، بەڵام گەورەترین و قورسترینیان بوو. پێش ئەوە لە سنوری قەڵا سێوکە و ئاغجەلەر چەند کادرێك و پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەم شێوەیە زەهر خوارد کران و شەهید بوون وەك کاك وریا سوور کە سەرتیپی ٢١ بوو لەگەڵ برادەرەکەی.

نمونەیەکی تری ئەم زەهر خوارد کردنە لە لایەن ڕژێمی بەغدا دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی مانگی ٣ / ١٩٩٦. کاك فاتح شوانی و

خێزانەکەی لە چەمچەماڵ دەرمان خوارد کران و تا ئێستەش بەم ئازارەوە دەناڵێنن و بەردەوام لە هات و چۆی دوکتۆردان. ئەوەندەی دەزانرێت لە پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی عێراقی و بزوتنەوەی ئیسلامیش دوچاری ئەم ڕەفتارە دڕندەیەی ڕژێمی بەغدا هاتوون.

لە لەندەن لە نەخۆشخانەی London Bridge Hospital مادەی دژ بەم ژەهرەیان دابونێ. قژیان نزیکەی هەمووی وەریبوو. لێپرسراوی ئەمنستی دەڵێ: "ژەهر خوارد کردنەکەیان لە بارودۆخێکی پڕ مەترسیدا بوە". لە ١٩٨٧/١١/٢٤دوکتۆر John Henry بۆ هەمان گۆڤاری سەرەوەی ئەڵمانی شتێرن دەڵێ:

"ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوە پزیشکیانە تەنیا یەك وەڵاممان ئەداتێ کە ئەویش یەك شتە: سالیۆم"

ناوەڕاستی مانگی ١/ ١٩٨٨ amnesti international داوای لە حکومەتی بەغدا کرد هەڵوێست بەرامبەر بەم تاوانە گەورەیە دەربڕێت، کە دامودەزگای ئەمنی عێراقی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی بە ژەهری کوشندە دەکوژن. جگە لەوانەی لەندەن ناوی (٧) لە بریندارەکانی تارانیش دەنوسن بۆیان. ٧ کەس لە ناو ٣٠ برینداری ژەهرخواردی مانگی ١٩٨٧/١١/٢٤ دا. وە لێرەدا نمونەیەکی تر بۆ حکومەتی عێراق بە یاد دێنینەوە کە پێشتر لە ئەیلولی ١٩٨٠ کە پێش بەردانی بەندە سیاسیە عێراقیەکان بە سالیۆم ژەهر خوارد کرابون. دوان لەوانە لە لایەن دوکتۆری بەریتانیەوە دوای گەیشتنیان بۆ بەریتانیا خرانە ژێر چارەسەر کردنی پزیشکیەوە. یەکێکیان کە مجید جهاد بوو لە بەریتانیا

کۆچی دوایی کرد و ئەوەی تریان چاك بۆوە. ئەمنستی بۆ ئەم پرسیارە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە هیچ وەلامێکی وەرنەگرتەوە. سەبارەت بە پرسیارەکەی ئەمنستی بۆ ڕوداوەکەی سێڕوان لە ناوچەی مەرگە چەند ڕۆژێك دوای ئەوە بالیۆزی عێراقی لە لەندەن هەلوێستی دەربڕی کە ئەم گوناهبار کردنانە درۆن و تەنیا (فەرەزیەن).

سێ ڕۆژ دوای نان خواردنە زەهراویەکە نەرمین حەوێز هەولی دابوو ڕۆلی نەخۆش ببینێ و خۆی بڕشێنێتەوە. کە ئەم شانۆگەرییەی بۆ تەچوبوە سەر بە پشتگیری ئەمن و موخابەراتی عێراقی خۆی گەیاندبوە سلێمانی و لەوێشەوە بۆ بەغدا.
کاك عدنان موفتی ئەو کات ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسك) بوو کە ئەو کات تەمەنی ۳۸ سال بوو. لە لەندەن بۆ گۆڤاری هەفتانەی (لەسەرەوە ناوبراوی) ئەلمانی Stern دەلێت:

" ئێمە بەردەوام دەبین لە خەبات کردن. ئەو کاتەی کە چاك ببمەوە دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ کوردستان".
نوسەر و شاعیر کاك سامی شۆڕش کە ئەو کاتە تەمەنی ۳۷ سال بوو یەکێك لە بەرهەمەکانی بۆ گۆڤارەکە لەسەر پارچە کاغەزێك دەنوسێت کە بەم وشانە دەست پێدەکات:

## - هەڵسانەوە -

" بە هەندرێنی کورد بڵێن:
هەزارەها گوریسە خوێن
بە تۆ ئەمانبەستێتەوە
بە سیروانی دەربەدەری بیابان بڵێن:
بۆ هەر کونێك ڕاتهاوێژن
هەزارەها سەروچاوەی پاك و خاوێن
بە تۆ ئەمانگەیێنێتەوە
بە کێو و دەشت ودەر بڵێن:
بە تفەنگ و خەنجەر بڵێن:
بە هەتاو و سێبەر بڵێن:
بە کەلاوەی سەنگەر بڵێن:
ڕۆژێ دادێ
هەوری سووری شۆڕش ئەجمێ و
لافاوی تورەی پێشمەرگە، جارێدی
هەڵئەستێتەوە.
ڕۆژێ دادێ
ڕەشەبا بەردەرکی سەرای سلێمانی ئەگرێتەوە.
بە هەندرێنی کورد بڵێن:
قەت کێو بە کێو ناگات... بەڵام
ئێمە بە تۆ ئەگەینەوە.[1]

---

[1]) کاك سامی ئەم شیعرەی لە مانگی حوزەیرانی ١٩٧٥ لە شاری بەرلین - ئەڵمانیا نوسیوە

نەرمین حەویز کە لە لایەن (مدیریە الامن) ی پارێزگای سلێمانی بۆ ئەم کارە ڕاسپێردرابوو، دوای ئەنجامدانی هەڵات. بۆ ڕۆژی دوایی (مکافئات) و خانویان دابوو بۆ ئەو کارە دڕندانە و نامرۆڤانەیەی کە ئەنجامی دابوو. نەرمین حەویز لە کاتی ڕاپەڕینەکەی خەڵکی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١ لە لایەن جەماوەری خەڵکی سلێمانی بە سزای خۆی گەیەندرا. [٢]

[٢]) سەبارەت بە ڕوداوەکانی مەرگە و مجید جهاد چەندین بەڵگەنامەی خەستەخانە و ڕاپۆرتی دوکتۆرەکانی لەندەن لای نوسەر هەن. هەندێکی لە پاشکۆی کتێبەکەدا بلاو کراونەتەوە.

(٤)

# گێڕانەوەی تراژیدیاکە لە دیدەی کاک مستەفا چاوڕەش

لە مانگی ١١/١٩٩٧ لە ئەمستەردام - هۆلەندە لە میوانداریەکم بۆ لای کاک مستەفا چاوڕەش چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ تۆمار کرد، کە بەرێزی تەواوی ڕوداوەکە لە دیدی خۆیەوە باس بکات، و سوپاسیشی دەکەم بۆ ئەو وێنانەی خۆی و شەهیدی دایکی کە پێشکەشی کردم بۆ بلاوکردنەوەیان لەم کتێبە. چاوپێکەوتنی دوەمم لەگەڵ کاک مستەفا بۆ هەمان مەبەست لە مانگی ١١/ ١٩٩٩ لە کوردستان بە ئەنجام گەیاند.

پرسیار: لەو ڕاپۆرتانەی کە ئەمنستی ئینتەرناشنال بڵاوی کردۆتەوە وێنەی تۆی تیا نەبوو.

وەڵام: بڵاو نەکردنەوەی وێنەی من لە ناو بریندارەکان دا دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی ئەو کاتەی کە منی تیا بووم لە نەخۆشخانەی لەندەن کە هیچ جوڵانەوەیەك لە لەشمدا نەمابوو. ئەو کاتە ڕۆژنامەکانی وەك تایمز و گاردیان، ئەو ڕۆژنامەنوسانەی دەهاتن و پرسیاریان لێ دەکردم وێنەشیان دەگرتین. من ئەو کاتە کە بە هۆی ژەهری سالیۆمەوە کە لە لایەن دەزگای موخابەراتی ڕژێمی سەدام حسێنەوە پلان کرابوو بۆمان لەسەر مردن بووم.

لەو کاتە خێزانەکەم و تەنیا کوڕەکەم لە بەندیخانەی (امن العامە) بەند بوون وە نەم وویست کە بە هۆی بڵاو کردنەوەی وێنەی منەوە شتەکە بە یاد دەزگاکانی ڕژێمی عێراقی بهێنمەوە

و خێزان و منداڵەکەم (ئەمەاوەند و زریان) کە ساڵ و نیوێك لە بەندیخانە بوون زیاتر دوچاری زیان و بەسەرهات بێن.

پرسیار: زریانی کوڕت کە ئەو کاتە تەمەنی ساڵ و نیوێك بوە، لە بەندیخانە چاوی کردۆتەوە و فێری چەندین ووشەی عەرەبی بوە. وە تەنانەت ئەمنی عێراقی جگەرەیان بە قاچی کوژاندۆتەوە. وە بۆ پڕۆپاگەندە و ئازاری دەرونی تۆ یاری منداڵیان خستۆتە بەردەمی و وێنەیان گرتوە. دوو ڕوداوی موازی بەیەك لە یەك کاتدا. تراژیدیای خۆت، وە خێزان و منداڵت لە بەندیخانە. ئەم بەسەر هاتە چۆن بوو، وە ئەم هەستە چۆن تەعبیر دەکەیت؟

وەڵام: گرتنی خێزان و منداڵی من دەگەڕێتەوە بۆ دڕندەیی ڕژێمی بەعس بەرامبەر بە گەلی کورد، نەك بە تەنیا بەرامبەر بە خێزان و منداڵی من. دوای فەشەل بونی گفتوگۆکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و ڕژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٨٤، دوای شەڕ دەستپێکردنەوە لە هەموو ناوچەکان، ڕژێمی عێراقی لە ساڵی ١٩٨٥ بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە و ئەم جارە زۆر زیاتر بێ بەزەییانە کەوتە ڕەفتار کردن لەگەڵ گەلی کورد.
مقەڕی مەکتەبی عەسکەری ئێمە ئەو کاتە لە دۆلی سێوان بوو لە ناوچەی مەرگە. جار جار کەس و کارەکانمان دەڕۆیشتنەوە بۆ سلێمانی بۆ جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی ڕۆژانە. ژن و منداڵەکەی منیش ڕۆیشتبونەوە. دەتوانم بلێم لە ١٩٨٧/٧/١٩ دا لە گەڕانەوەیان دا دیارە لە لایەن ئیستخبارات و سیخوڕەکانی بەعسەوە ئیخباری کرابوون. هەر ئەو کاتەش خێزانێکی تریش کە لەگەڵیان هاتبوو وە خزمی خۆمان بوو، نەقیب ئەمیر،

ئەمیری کەریم چاو شین کە نەقیبی شورتە بوو، ئەویش لەگەڵیان چوبوو کە خێزانەکەی خۆیشی لەگەڵ خۆیان بهێنێت. تا ئەو کاتەی کە ئەو ڕۆیشتبوو بیانهێنێت دیارە بە هەر شێوەیەك بوبێت ئیخباری کرابوون. لە سەیتەرەکەی تاسلوجەی سلێمانی مەفرەزەیەکی ئەمن بە تاییەت چوبوو لەوێ سەیتەرەی بۆ دانابوون. یەکسەر ناسیبویاننەوە و دایان بەزاندبون.

ئیتر لەو کاتەوە لە ١٩٨٧/٧/١٩ وە تا ١٩٨٩/١/٦ کە بە لێبوردنی گشتی ئازاد کران،نزیکەی ساڵ و نیوێك بەند بوون. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خێزانی من بوو، چونکە زۆر کەسی تر کە خێزانی هەبوو بەردەبوون. لەبەر ئەوەی کە من لێپرسراوێتیم هەبوو لە بزوتنەی کورد دا دەیانویست تەنازولم پێ بکەن یان تەسلیم ببمەوە.

تەنانەت خەڵکی تر بێ کەفالەت بەربوون، بەڵام خێزانی من بە کەفالەتی باوکی لە بەندیخانە ئازاد کرا. ئەو خێزانەش کە لەگەڵیان گیرا نەوجوانی ناو بوو کە کچی جەلالی ئەحە ڕەش بوو لەگەڵیاندا دایکیشی گیرا. دوای ماوەی مانگێك نەقیب ئەمیریش لە دۆلی بەرگەڵو سەرگەڵو بەر کیمیاوی کەوت.
لە مقەڕی کاك نەوشیروان بوو کە بە کیمیاوی بۆمباران کران. تۆپێکی کیمیاوی دای لە مقەڕەکەیان و چوار پێشمەرگەی تیا شەهید بوو. یەکێکیان شێخ محەمەد بوو خەڵکی سلێمانی کە خێزانەکەشی گیرا بوو. دوەمیان مە حمود سێدەری بوو کە پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمانی میللەتەکەمان بوو لەگەڵ کوڕەکەی مە حمود سێدەری هەر چواریان لەوێ شەهید بوون.

ئەو فەترەیەی کە ئەوان سجنیش بوون باسی ئەوەت لێ پرسیم کە چۆن ڕەفتاریان لەگەڵ کردون. ئەو ماوەیەی کە خێزان و منداڵەکەم بەند بوون. زریان بە تەمەنی یەك ساڵەیی چوە بەندیخانەوە. وە بە تەمەنی دوو ساڵ و نیوی لە بەندیخانە بەربوو. مانای نزیکەی ساڵ و نیوێك بەند بوو. منداڵێکیش لە (امن العامە) ی بەغدا بێت وە لەگەڵ خێزانی گرتوی عەرەب ژیابوو، کە هاتە دەرەوە هەندێ ووشەی عەرەبی فێر ببوو، و کوردی نەدەزانی.
ئێمە کە دەعوەت کراین بۆ تەلەفزیۆنی BBC لە لەندەن دوای ئەوەی کە خۆیان گەیاندە ئێرە و منیش چووم بە دوایان دا و هێنامن، لە کاتی چاوپێکەوتنەکە ئەو شوێنەی قاچی کە بەعس جگەرەیان لەسەر کوژاندبوەوە هەر هێشتا دیار بوو. ڕژێمی بەعس تەنانەت ڕە حمی بە منداڵ و بە پیرو پەککەوتەش نەکردوە، تەنیا گوناهیان ئەوە بوە کە کورد بوون. تا ئەم ماوەیەش شوێنەواری هەر دیار بوو کە تەمەنی ئێستە بۆ دوانزە ساڵ دەچێت.

پرسیار: باسی ئەوە دەکرێت کە خەزور و کەس و کارت لەسەر لێپرسراوێتی و ناسراوی و چالاکی پێشمەرگایەتی تۆ لە (امن العامە) گیراون و ئەشکەنجە و ئازار دراون.
وەڵام: گرتن بۆ هەموو کەس بوو نەك بە تەنیا هەر بۆ ئێمە. دیارە کە کەسایەتیش زۆر جار مەبەستیانە. من پێش ئەوەی کە ژنیش بهێنم، ڕژێم چوبونە ماڵی کەس و کارم و دایکمیان گرتبوو. ماوەیەکی زۆر بەند بوون و کەس نەیدەزانی لە کوێ. لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە خێزان و منداڵی تر بردبونیان بۆ سنجار لە سەر سنوری سوریا. حکومەتی بەعس وای دەزانی کە

ئەو ئەگەر دایکی من بێت لێپرسراوی تەنزیمی سلێمانی و نهێنییەکان لای ئەوە.
کە هاتەوە ووتی ڕۆڵە سەدام بەری نەئەداین، زابتەکە باش بوو بەری داین. نەی ئەزانی هەموو شت بە دەست سەدام حسێنە. لێم پرسی لە کوێ بەند بوون. ماوەیەکی زۆر بیری لێ کردەوە و ووتی لە نەجار، مەبەستی لە سنجار بوو. دایکی من لەوێ بەند کرابوو.[٣]
ماوەیەکیش خەزورم بەند بوو لەوێ کاك حسێن لەسەر ئەوەی کە کوڕیان لە دەرەوە پێشمەرگەیە. ئەمە بۆ هەموو پێشمەرگەیەك وە بۆ هەموو کوردێکە کە هەناسەی کوردی پاکی بدایە. بەڵام دیارە زیاتری بۆ پێشمەرگە بوو. ئەم شتەش لە ساڵانی ١٩٨٥ بۆ ٨٦ بوو.
هەر لە سەرەتای شۆڕشی ئەمجارەشمان کە دەستی پێ کردەوە بە سەرۆکایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەم شتە ڕووبەڕووی هەموو کەس و کاری پێشمەرگەکان ببوەوە. من هەر هێشتا تازە گەیشتبومەوە سەر سنور ئەوانەی کە لە دەرەوە بوون کەس و کاریان هەمووی لە بەندیخانە بوون. ئیتر ئەوانەی کە دەستیان گەیشتبێت پێیان لە منداڵ و ئافرەت و خێزان... ئەو فەترەیەش کە من خۆم ئامر هەرێمی قەرەداغ بووم، خالد کە کوڕی خاڵمە ئەویش برایەکی (ئاسۆ) شەهید بوو. دایکی و خوشکێکی زیاتر لە ساڵێك بەند بوون و دوایی لەگەڵ ئەو خەڵك و خێزانانەی تر بەر بوون بە لێبوردنی گشتیەکە. ئەمەش مەسەلەی بەشێك لە

[٣]) نەبێت مرۆڤ پێناسەی ڕژێمێك چۆن بکات و چەندە شەرمی و سەرشۆڕیە کە دەستی بچێتە ئەوەی ئافرەتێکی، دایکێکی سادەی نەخوێندەواری، بێگوناهی دانیشتوی خەلکی وولاتەکەی خۆی لە بری ڕێز و دانی مافی دایکایەتی بیخزێنێتە نێوان چوار دیواری بەندیخانەیەك

کەس و کاری من، بەڵام من هەموو کورد بە کەس و کاری خۆم دەزانم.

وە هەروەها ئەکرەم حەپسە تێکۆشەرێکی ناسراوی خاوەن باوەڕی بەهێز بە زە حمەتکێشانەوە ، لەسەر ئەوەی نامەیەکی بۆ من نوسی لە ساڵی ١٩٨٠ پاش ئەوەی بە هۆی خۆفرۆشانەوە دەست ئەمنی سلێمانی کەوت ئەکرەم گیرا و پاش هێنان و بردن بۆ هەیئەی کەرکوك و هێنانەوەی بۆ سلێمانی بەعسیە خوێنڕێژەکان ئەم تێکۆشەرە بەهێزەی گەلەکەمانیان تەنها لەسەر نوسینی نامەیەك لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠ ئیعدام کرد و هەموو شاری سلێمانی شاهێدی خەباتی ئەکرەمی حەپسەن کە پوززامە. کاك ئەکرەم ئەندامی یەکێتی نەبوو.

پرسیار: پێش ئەوەی بێمە سەر ڕوداوەکانی ساڵی ١٩٨٨ ی ناوچەی مەرگە، بە لامەوە گرنگە ئەگەر بتوانیت کورتەیەکی مێژووی ژیانی خۆت، فاکتەری پاڵپێوەنەر چیبوە کە وات لێبکات ببیتە پێشمەرگە و پەیوەندی بە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی کوردەوە بکەیت، و کەی پەیوەندیت کرد بە (ی.ن.ك) وە.
وەڵام: دیارە کە منیش وەك زۆربەی زۆری ئەو خەڵکانە چاوم کردەوە لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی بووین. سەردەمی عبد الکریم قاسم مەدی بیر کردنەوەی پێشکەوتوخوازیی هەبوو لە کوردستان و لە عێراقیش. کە بومە خاوەنی بیروهۆشی خۆم کەس و کارەکەم شیوعی بوون. منیش ئەو کاتە هەولم ئەدا هەرچۆنێك بێت بچمە ناو جوڵانەوە. ئەو سەردەمەی کە مەلیك کوژرا من پێم ناخۆش بوو ، چونکە هوشیاری سیاسی ئەوتۆم نەبوو. لە ساڵی ١٩٥٨ من تەمەنم ئەو کاتە ١٢ ساڵ بوو.

لە ساڵی ١٩٦٢ چومە ڕیزی جوڵانەوەی نیشتمانی لە قوتابخانە لە ناوەندی. چومە ڕیزی حیزبی شیوعیەوە و تا ماوەی ١١ ساڵ شیوعی بووم. بە پلەکانی حیزب دا ڕۆیشتم تا بوومە ئەندامی فەرعی کوردستان لە حیزبی شیوعی کوردستان ئەوەی قیادەی مەرکەزی.

لە ساڵی ١٩٦٧ دوای کەرت بونەکەی حیزبی شیوعی من لەگەڵ تەیارە شۆڕشگێڕیەکەیدا ڕۆیشتم (قیادە المرکزیە - عزیز الحاج). تا ساڵی ٧٣/١٩٧٢ کە گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ئیتر ناتوانم لەگەڵیان دا کار بکەم.
دوای ئەوە پێش دەستپێکردنەوەی شەڕی ١٩٧٤ چومە دەرەوە و بومە پێشمەرگە و تا ئەو ماوەیە سەرلق بووم لە پێنجوین. ئەو کاتەی کە شەڕ دەستی پێکردەوە ئێمە لە پێنجوینەوە چوین بۆ ڕەواندز کە شەڕی قورس لەوێ بوو. کە حکومەت پەلاماری داین و تۆپبارانی خەستی کیمیاویشی کردین ئێمە لە جەبهەی گەروی هۆمەر ئاغا بووین لە نزیك شاخی زۆزك.

زاهیری برام لەوێ (١٩٧٤/١٠/٢١) بەر فسفۆر کەوت لەگەڵ مە حمود ڕشید کە لەقەبەکەی نەبەزە. تا ئێستاش شوێنەواری ئازار و ناخۆشی هەر تیایاندا دیارە. ئەو کاتە ئەم مەسەلەیە بوە ڕوداوێکی گەورە، چونکە یەکەم جار بوو کە فسفۆر بەرامبەر بە کورد بەکار بهێنرێت، کە زاهیری برام یەکێك بوو لەوانەی کە بە خەستی بەرکەوت.

زاهیریان نارد بۆ لەندەن بۆ چارەسەر کردن، و دوای ناشیەتاڵ ناردیانەوە بۆ ئێران. لە ١٩٦٥/٥/٤ من چومە دەرەوە بۆ

پێشـمەرگایەتی و تـا ئێسـتاش دانـەبڕاوم لـە خـەبات و لـە بزوتنەوەی نیشتمانی. ئەوەی لە توانامدا بوبێت پێشکەشم کردوە بە گەل و بزوتنەوەکەی بە خۆم و بە کەس و کاریشمەوە.
بە هۆی زاهیری برامەوە لە ساڵی ١٩٧٦ هاتمە هۆڵەندە. لە ساڵی ١٩٧٧ هەموو لە سەر سێ ناوچەکەی سنور لە تورکیا یەکمان گرتەوە لەگەڵ بەڕێزان مام جەلال و کاك نەوشیروان و هاوڕێیانی ترم. ٢٠ ڕۆژ بە پێ بە ڕێگاوە بوین تاوەکو گەیشتینەوە ناوچەی سلێمانی بە سنورەکانی تورکیا و ئێران و عێراق. هەندێ چەك و تەقەمەنیمان بردەوە لەگەڵ خۆمان بۆ ئەوەی شۆڕشی پێ بکەینەوە. بۆ بەرگری کردن لە نەتەوەکەمان و لە دژی سیاسەتی بەعس کە دەیەوێت لەناومان بەرێت. دەتوانم بڵێم کە تەنیا کەسێك بووم لەو کاتەدا کە داوام لێ کرا، و لە ئەورووپاوە ڕۆیشتمەوە. بە ماندو بوون و هیلاکی و خەباتی سەختی خۆم بە قۆناغەکانی مەسئولیەت دا تێپەڕم کرد. لە ئامر مەفرەزەییەوە بۆ ئامر کەرت و لەویشەوە بۆ ئامر هەرێم. لە ئامر هەرێمی سێی شارباژێڕ بووم کە شەهید سیروان ئامر هەرێمی (٥) ی قەرەداخ بوو بە دەستی جاشەکان شەهید کرا، حەمە خانی حاجی دارا کە جاش بوو وە ئێستە فەرماندەی سوپای مسعود بارزانیە.

دوای شەهید بوونی سیروان منیان نارد بۆ ناوچەی قەرەداغ و لەوێ سێ ساڵ ئامر هەرێم بووم. لەوێ لەگەڵ پێشمەرگە و کۆمەڵانی خەڵك ڕۆڵێکی باشمان دەبینی. ئەمانەی کە باسی دەکەم هەمووی بە هەوڵ و ماندو بوون و خەباتی پێشمەرگە و شەهیدەکانی خەڵکی کوردستانیشەوە هاتۆتە دی، کە من تەنیا تاکە کەسێکم تیایدا.

کە من بە دەستەکەی خۆمەوە چومە ئەوێ و توانیمان ڕۆڵێکی باش ببینین لە ١٩٧٩/٨/١٩ بومە ئامر هەرێم، لە مانگی ١٩٨٢/٥ پلەم بەرزتر کرا، و نەقڵ کرام بۆ مەکتەبی عەسکەری. کە من بە دەستەکەی خۆمەوە چومە ئەوێ بریتی بوین لە ١٢٠ پێشمەرگە بە هەموو ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان و ناوچەی کەرکوك. زۆر لەو هەڤالانە وەك شێخ جەعفەر و مام ڕۆستەم و برایانی ترم. کە بەجێم هێشتن و نەقڵ بووم ٨٠٠ پێشمەرگەم بە جێ هێشت. ئەو کاتە قەرەداغ بوبوە چقلی چاوی دوژمنان و لە هیچ دێیەکیش نەماندەتوانی بێ مەترسی بحەوێینەوە و هێرش و پەلاماری دوژمنمان هەمیشە لەسەر بوو. ئەوانەش کە لەو سەردەمەدا لەگەڵ حکومەت دا بوون وەك قالە فەرەج، تەحسین شاوەیس فەرماندەی سوپاکەی مەسعود بارزانی، ئەمانەش کوڕی میللەتەکەمانیان دەکوشت. ئێمە توانیمان لەم ناوچەیە شتێك دروست بکەین.

دوای ئەوە نەقڵ بووم بۆ مەکتەبی عەسکەری لە کاتی پشتگیری برا کوردەکانمان لە کوردستانی ئێران. دوایی کە مەڵبەندەکان دروست بوون و کرام بە لێپرسراوی عەسکەری لە مەڵبەندی دووی کەرکوك کە مقەڕەکەی لە سەرگەڵو بوو. لێپرسراوی هەموو هێزی پێشمەرگەی ئەو ناوچەیە بووم تا ئەو کاتەی لە سێروان زەهر خوارد کراین.

پرسیار: مێژووی خەبات و کەس و کاری تۆ و بەسەر هاتەکانی ئێوە لە لای گەلی کورد و مێژووی نەتەوەکەمان بۆ هەمیشە ڕوون و ئاشکرایە. دەکرێ باسێکی ئەو بەسەرهاتی زەهر

خواردنـه بکـەیت، کـە چـۆن ڕێکخـرا، و کـێ ڕێکـی خسـت و ئەنجامەکانی چی بوون؟
وەڵام: لەسـەر ڕوداوەکـانی ناوچـەی مەرگـە دیـارە ئـەوە وردەکاریـەکی دەوێت کـە مـرۆڤ پیـایدا بچێتـەوە کـە ئـەم بەسەرهاتە چۆن بوە. ئێمە مفەرەزەکانمان لە ناوچەیەکی شاخاوی سەخت بوو. هەموو ئەو پێشمەرگانەی کە خێزانیان هەبوو لەو ناوچانە بوون هەر یەکە و لە پەنایەکدا ژوورێکی بۆ خۆی پەیدا کردبوو. منیش ئەو کاتە لێپرسراوی هەموو هێزی پێشمەرگەی ئەو ناوچەیە بووم کە خۆی لە نۆ تیپ دەنواند، تیپەکانی ٦٥ی بالەت ، تیپی ٦٣ ی جوتیاران، تیپی هۆمەر ئاغا، تیپەکەی شێخ سەدرەدین (تیپی ٤٤ی چەکوچ) و تیپی ٤٣ ی ئاسۆس و زۆری کەش.
لەو کاتەش دا هەروەك باسم کرد شەڕی سەخت بوو لە نێوان ئێمـە و هێـزی داگیرکـەران دا. دوای ئـەوەی کـە داسـتانی ڕزگاریمان کرد کە هەر من لێپرسراوی شاخی ئاسۆس بووم.
لە داستانی ڕزگاریدا هەموو شاخی ئاسۆسمان گرت کە نزیکەی ١٦ ڕەبیئە بوو و چەندین زابت و سەربازی ترمان بە دیل گرت. بـەڵام دیارە بـە حوکمی ئـەو بارودۆخـەی ئـەو کاتـە ئێمـە لـە ناوچەکانی خۆمان کشاینەوە.
بۆ جاری دوەمیش کـە سـەرکردایەتی بڕیاری دا کـە پـەلاماری بەعس بدەینەوە بۆ ئەوەی ناچاریان بکەین کە مل کەچ بکەن بۆ داواکاری میللەتەکەمان.

من لـەو ماوەیەدا تەندروستیم هـەندێ تـەواو نـەبوو. هەستم بـە ناخۆشیەك دەکرد لە خۆمدا. لە پێشمەرگایەتیدا کەم کەس هـەبوو کە بتوانێت پێشم بکەوێت. زۆر پێشـمەرگە لـە لای منـەوە خـۆی

نەقل دەکرد و دەیان ووت ئێمە تەحەمولی ئەم هەموو ڕۆیشتنەی تۆ ناکەین.

دیارە کە خێزانی ئەو پێشمەرگانەی لەوێ لە لامان بوون خەڵکی باش و خراپیشی تیا دەبێت. یەکێك لەوانەی کە یەعس کەڵکی لێ وەرگرتبوو ژنی جەباری عەلی عەوێز بوو کە ناوی نەرمینە. نەرمین کە چوبووەوە بۆ سلەیمانی لەو کاتەوە کەڵکیان لێ وەرگرتبوو. پێشتریش وەختی خۆی گیرابوو دیارە لەو سەردەمەوە پەیوەندیەکی بە ئەمنەوە هەبوە. سێ یان چوار ساڵ پێشتر گیرابوو وەماوەیەك لە بەندیخانە بوو لە سلێمانی وە ژنی پێشمەرگەیەك بوە. لەو ماوەیەدا کە هاتەوە من وەك مێژوو دەیلێم کە جەبار کابرایەك بوو کە پێشمەرگایەتی کربوو، بەڵام سەرسەری تەبیعەت بوو. بە هۆی عەرەق خواردن و سەرخۆش بونەوە ئێمە ویستمان لە ناوچەکە دەری بکەین. من و ملازم عومەر کە خۆی لەسەر ژیانە و وەزیری ناوخۆی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.

ویستمان کە بانگی بکەین و ئامۆژگاری بکەین کە ئەو ئەوەندە نەبوو دوای ماندوبونێکی زۆر لە بەندیخانە بەربوو. من و کاك مولازم عومەر ویستمان بە جیا دەعوەتی بکەین و پێی بلێین کە ئەم ڕەفتارە باش نیە بە تایبەت لە لادێ عەرەق خواردنەوە بۆ سومعەی خۆیشی و پێشمەرگەش و بۆ مەسەلەی دینیی باش نیە کە بە چاوێکی خراپەوە تەماشا دەکرێ.
لەو ڕوانگەیەوە پەیوەندی و هاتوچۆ دروست بوو. لەو سەردەمەشدا کە باسم کرد ژن و منداڵەکەم لە بەندیخانە بوون. نەرمین حەوێز کە هاتبوە ماڵمان، کەدیارە ئافرەتیش لە ماڵ دا

بێت هاتوچۆی مەتبەخ دەکات و دیارە کەڵکی لەوە وەرگرتبوو کە بتوانێت دەرمان بکاتە ناو خواردن و شتەوە. من دیارە کە ئەو هیلاکی و ناڕەحەتیەی پێشترم هی ئەوە بوە کە دەرمانی بۆ کردبومە ناو خواردنەوە.

بەیانیەکیان هەستام و چووم مولازم عومەرم لە خەو هەستان. ئەو شەوە هەر لە کاتژمێری ١٢ ی شەوەوە خەوم لێ نەدەکەوت و هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە ژن و منداڵەکەم لە بەندیخانەن و شتێکی قورس بوو لە سەر دل و هەستم و ئەم شتەم لە خەیاڵ دەرنەدەچوو.
هەر ئەو شەوە هەستام وەسیەتم نوسی. ٢٠٠٠ دیناری ئەو کاتەم هەبوو، کامێرایەکی ڤیدیۆم هەبوو کە زاهیری برام ئەو کاتە هاتەوە بۆی بەجێ هێشتبوم. لە نامەیەکدا بۆ مولازم عومەرم نوسی کە ئەگەر شتێکم لێ هات ئەم پارەو کامێرایە بدە بە ماڵ و منداڵەکەم.
بیرم لەوە دەکردەوە کە من نەخۆش نەبوم و بە توانام. ئەم ئازاری سنگ و ناڕەحەتیە لە جەستەم دا هەر دەبێت ئەم ژنە دەرمان خواردی کردبێم.

کە بەیانی زوو کاك عومەرم هەستان ووتی تۆ چۆن شتی وا دەڵێیت. پێم ووت کە من گومانم لەم ژنە هەیە کە ڕۆژێکیان پێی ووتم " من دەتوانم بچم مواجەهەی ژنەکەت بکەم، بەڵام ناتوانم بەریان بدەم". کەسێك کە ژنی پێشمەرگە بێت چۆن دەتوانێت وا بە ئاسانی بچێت مواجەهەی ژنی من بکات لە دامودەزگایەکی وا حەساسی حکومەت دا، لەبەر ئەوە لێی کەوتمە گومانەوە.

ووتم هەر ئەم دەبێت زەهرێکی بۆ کردبمە خواردنەوە. مولازم عومەر ووتی کاك مستەفا بڕوا مەکە و شتی وا چۆن دەبێت. ووتی ئەم جارە کە هاتەوە تۆ جارێ جانتاکەی بپشکنە. ئەو ڕۆژەی کە بۆ جاری دوایی دەرمان خوارد کراین هێزەکانی ئێمە لە ١٩٨٧/١١/٢١ بڕیارمان دا لە هەموو لایەکەوە هێرش بەرینەوە سەر هێزەکانی ڕژێم. بۆ ئەم مەبەستەش هێزێکی زۆرمان هێنابوو لە گەرمیان و شوێنەکانی ترەوە، و هەمان شاخی زینۆی سپی بگرینەوە کە کۆتایی شاخی ئاسۆسە.

هەمومان کە بە ڕێگاوە بوین بۆ ئەم مەبەستەو خۆمان بەستبوو بۆ ئەوەی بەسەر ئەو شاخەدا سەرکەوین، بەڵام من هەر بێ تاقەت دەبووم و ئەو هێزو وزەیەی جارانم نەمابوو. کاك مولازم عومەریش کە ئەو کاتە بۆ کاروبار چوبوەوە بۆ مەکتەبی سیاسی، هات سەرپەرشتی کارو ئیشەکان بکات. ئەو ڕۆژە بەشێکی هێزەکان دواکەوتبوو وە لێیان تورە بوو، منیش لە پەنا دارێکدا دانیشتبوم و تاقمی تەراش و جانتا و تفەنگ و فیشەکم دانابوو، بە خۆمم ووت ملازم عومەر وا بیر نەکاتەوە کە من ڕوخابم یا تاقەتم چوە، چونکە وا تەماشای دەکردم کە نازانێ تەندروستیم بە جۆرێکی وا خراپ بوە. پێشتریش هەر دەیزانی کە تەندروستیم باش نیە.

کە هێزەکە ڕۆیشت، و خۆیشی لەگەڵیان بەسەر شاخەکەدا سەربکەوێت هاتە لام و وتی کاك مستەفا تۆ ئەم جارە لەگەڵمان مەیە باشترە و دەبینم کە نەخۆشیت. وتم کاك عومەر ئەگەر من

بێم لەبەر خاتری تۆ دێم، چونکە من لە داستانی ڕزگاری دا شارەزایی شاخەکەش و ناوچەکەشم هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی هێزەکەتان پاشە من نایەم.
ووتم هەروەك مەسەلەی ئێرانی وتەنی من ئەڕۆم سەرپەرشتی تەداروکاتتان بۆ ئەکەم و شتتان بۆ دەنێرم. کە ئازوقە و فیشەك و پێویستی ترە.
کە هاتمە خوارێ ناردم بە شوێن سەریعەی مەلا محرەم کە کچی ئیمام مەرگەی خەتیبی مەرگە بوو کە خزممان بوو،کە یارمەتی دایکم بدات. ووتم هەروەك خۆم ئەچوم، بەڵکو هەندێ خواردنیان بۆ دروست بکەین لە ناوساجی و مریشکیان بۆ سور بکەینەوە و لە سلێمانیشەوە هەندێ خواردەمەنیشیان بۆ ناردبوین وەك مریشکی موجەمیدە. لەو کاتە کە ئوتومبیلەکەم نارد ئیسماعیل خانەقینی سایەق بوو. لەگەڵ تریفەی خوشکەزام دا ناردمنە خوارەوە بە دوای کچەکەی مەلا محرەم. کە گەڕابونەوە دوبارە ئەو ژنەش ئەرمین لەگەڵیان دا هاتبوو، و دیم لە ناو ئوتومبیلەکەدا بوو، کە ڕۆژی پێشوتر لە سلێمانی گەڕابۆوە. کچەکەی مەلا محرمیش وتبوی عەسر دێم کە براکەم گەڕایەوە پرسی پێ دەکەم و ئەوکات دێم.

کە نیوەڕۆ هاتن و گەیشتنە ئەوێ، ئیتر کە مقەڕیش قەرەباڵغی تێدا دروست بوو، مرۆڤ خواردن و شتی تیا نابینێت.
لەو نیوەڕۆیەدا د. محمود علی عوسمان هات کە ئەو کاتە لە حیزبی سۆشیالیست بوو لەگەڵ کاك عدنان مفتی بەرەو ئەوە هاتن کە سەرکەون بۆ لای من کە ئەو کاتە لێپرسراوی هەموو مقەڕەکە بوم لەوێ. بیرم لەوە کردەوە کە عەیبە ئێستە من ئەمان بەرم بۆ مقەڕ و هیچیشی تیا نیە. ماڵەکەشم هەر لە پشتی

مقەڕەکە بوو. وتم فەرموون با بچینە ماڵی خۆمان. دوای دانیشتن و چا خواردنەوە دەوری شەش کەسێکی تریشیان لەگەڵ بوو وەك کاك سامی شۆڕش و کاك عدنان و کاك ئاوات کە هاوڕێی شێخ دارا بوو، وە کاك بێستونی مەلا عومەریش کە هەمویان هاوڕێی زۆر خۆشەویستم بوون و ماڵەکەی هەر لە تەنیشت ئەوەی منەوە بوو.

پێم ووتن کە نیوەڕۆ لێرە بن، تەماشای یەکیان کرد و دیارە خۆشیان کە مقەڕ و جێگەیان نەبێت نانیش هەر لای من دەخۆن. وتم دایکە نان دروست بکەن. ئەو نەرمینەش لەوێ بوو دیارە ئەم جارەش لەو ژەهرەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. جاری پێشوو کە ملازم عمر وتی جانتاکەی بپشکنە، یان کە ئەمجارە هاتەوە سەیری بکە. سەرقاڵم کرد و جانتاکەیم بردە ئەو لاوە و پشکنیم و لە ڕاستیدا هیچی وام تیا نەدی لە شتی ژنانە زیاتر.
تەنیا شتێکی تیا بوو لە شوشەیەکی بچکۆلەدا بوو من وام زانی ئەمە بۆیەی نینۆك و شتی وا لێ دەکاتەوە. جانتاکەیم لە شوێنی خۆی بۆ دانایەوە.

دوای دەرمان خواردنەکە ئەو شوشەیە لە ئاودەستەکەی خۆمان شکابوو. دیارە دوای بە ئەنجامدانی کارەکەی شکاندبوی. شەڕەکە کە لە ٢١ وە دەستی پێکردبوو من هەموو پێویستیەکانم بۆ دەناردن. ئەو بەرەیەی کە ئێمە شەڕمان لێ دەکرد (زینوی سپی) لە سنوری ئێران و عێراق بوو، ویستمان بیگرین تا بتوانین جێگاکانی خۆمان فراوان بکەین لە دژی بەعس کە دەکەوێتە لای گەلاڵە و سەفرە و زەروێن و ئەو ناوچانە کە بە پێ تا ناوچەی مەرگە ٣- ٤ کاتژمێر دەبوو . شەڕەکە لە بەری ئەو

دیوی شاخەکە دەستی پێکردبوو، وە ئێمە لە ناوچەیەکی تر بوین.

کە لە دوانزەو نیودا نان خورا، لەو کاتەدا دوو پێشمەرگەمان شەهید بوون، یەکێکیان خەڵکی ناوچەی (ئوردوگای) توە سوران بوو نزیك سەنگەسەر. یەکێکیان سەرداری سایەقی مولازم عومەر بوو. کە شەهیدەکەیان هێنایەوە بۆ ناشتن منیش بە د. محمودم ووت هەروەك لێرەدن ئێوەش وەرن، چونکە پێشتر بارەگایان لەوێ نەبوو وە تازە ئاشتبونەوەی گشتی بوبو، شەهیدێك هەیە و دەشبێت بچینە سەر گۆڕەکەی.
د. شوان کە دوکتۆری شۆڕش بوو وە کە ئێستە خۆی وابزانم لێرەیە لە ئەوروپا هاتبوو دایکی ببینێت. د. شوان بە هۆی بینینی و تەداوی نەخۆشەوە دوا کەس بوو کە هات بۆ نان خواردن.
ماستاومان بۆ تێکرد. کە خواردیەوە ووتی ماستاوەکەتان تاڵە. منیش ووتم چوزانم لەوانەیە هی ئەوە بێت کە ماستەکە بۆ دوو یان سێ هەفتە دەخەینە موجەمیدەوە و تامەکەی لەوانەیە بەو هۆیەوە گۆڕابێت. دوای نان خواردن چوینە سەر گۆڕی شەهیدەکە. لەوێ هەندێ چاوەڕێمان کرد چونکە قەبرەکەی هێشتا تەواو نەبیبوو.

بێستونی مەلا عومەر ووتی من نازانم هەندێ گێژ بووم. منیش ووتم بچۆ لای ئوتومبیلەکە دانیشە. مەتارەیەك ئاویشم پێبوو دامێ، دەموچاوی پێ شت. دوای ناشتنی شەهیدەکە چوینەوە لای ئوتومبیلەکە، بینیم کە کاك بێستون ڕاکشابوو. ئێمەش، من و د. محمود علی عوسمان و کاك شوان و ... هەموو لە

ژەهرەکەمان خواردبوو، بەڵام هێشتا لێی دیار نەدابوین. لەو کاتەشدا سریعەی مەلا محرمیش هات بۆ لای دوکتۆر و ووتی منیش سەرم گێژ دەخوات. دوایی کە فەحسی کاك شوانیان کرد ووتیان کە توشی نەخۆشی دڵ بوە.

دوایی کە سێ دوکتۆرم لەسەر بوو وە فەحسیان کردم، خۆم گومانم لەوە هەبوو کە دەرمان خواردیان کردبم. ووتیان دەرمان خواردی چی، ئەگەر شتێکی وا ببێت بە یەك کاتژمێر دەتکوژێت. ئیتر من کە گوێم لەوە بوو لە قسەکەی خۆم پەشیمان بومەوە. ویستم سریعەی مەلا محرم بخەمە ئوتومبیلەکەوە و بیبەمەوە بۆ مەرگە کە لە مقەرەکەی ئێمەوە نیو کاتژمێر بوو بە ئوتومبیل. لەو کاتەدا بانگیان کردم و وتیان وەرە دایکت داوات دەکات. کە چووم ووتی مستەفا توشی ئازاری مەعیدە بووم. هەر ئەوەندەی ووت. هێنامە لای دوکتۆر و ئیسعاف هات، بەڵام بێ ئەنجام بوو.
بە کورتیەکەی ژەهر خواردنی ئێمە بە هۆی ئافرەتێکی کوردەوە بوو کە ناوی نەرمین حەوێز بوو، ژنی جەباری علی حەوێز بوو. لە ئەمنی سلێمانیەوە ڕایانسپاردبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. حکومەت کە بە فرۆکە و ئامرازی تری سەربازی ناتوانێت هەستێت بە هەموو کارێك پەنا دەباتە بەر ئەم ڕێگایانەش.
ئەم شتەش هەر بۆ ئێمە نەبوو. پێشتر لە ناوچەی تیپی ۲۱ ی کەرکوك هەر لە ڕێگای بە عسەوە و بەم ئامرازە کۆمەڵێك پێشمەرگەیان دەرمان خوارد کرد کە یەکێکیان ناوی ووریا سوور بوو. لەم ساڵانەی دوایشدا لە ۱۹۷٦ فاتح شوانی و خێزانەکەی لە چەمچەماڵ ژەهر خوارد کران. من کە ڕۆشتمەوە لە ئێران چاوم پێی کەوت، وتی باروودۆخم باش نیەو لە هەمان

زەهرەکەی تۆیان داوە بە منیش. کە کاتێك من لە تەورێز بووم ئەم کاك فاتح شوانیە کە هاوڕێ و ناسیاوم بوو هات بۆ لام بۆ نەخۆشخانە.

ئەم ڕەفتارە بەرامبەر بە ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیش کرا بۆ نمونە بەرامبەر بە شیۆعیەکان. وە بەرامبەر بە کاك سامان کرا لە گەرمیان کە جێگری من بوو. ئەویش ماوەیەك گومانی هەبوو کە زەهر خوارد کرابێت. حکومەتی بەعس درێغی نەکردوە بۆ لە ناو بردنمان.

ئەوەی کە من باسی دەکەم شتێکی زۆر بچکۆلەیە لەگەڵ بەراورد کردن بەوەی کە بەسەر میللەتەکەمان دا هاتوە. ئێمە تەنیا چەند کەسێك بوین لەم ڕوداوەدا، بەڵام مرۆڤ بیر لەو هەموو بەسەرهاتە بکاتەوە لەوەی کە بەعس کردویەتی، بۆ نمونە ڕەفتاری بەعس لە بەکار هێنانی کیمیاوی و ئەنفال کردنی ١٨٢ هەزار لە مرۆڤی کورد بە تایبەت لە خەڵکی گەرمیان و و بێ سەروشوێن کردنی چەند هەزار بەرزانی و وێران کردنی چەند هەزار دێهاتی کوردستان... من کاتی خۆیشی لە کوردستان بابەتێکم نوسی سەبارەت بە دادگا کردنی سەدام.

لە ڕۆژی ١١/٢٤ لە کاتژمێری دوانزە و نیوی نیوەڕۆ لەو ڕوداوەدا دایکی من خدیجە حسین ئەمین کە تەمەنی ٦٤ ساڵ بوو شەهید بوو. سریعەی مەلا محرم کە کچی ئیمام جومعەی مزگەوتی مەرگە بوو، لەگەڵ یەکێك لە تێکۆشەرانی میللەتەکەمان بێستونی مەلا عومەر کە یەکێك بوو لە پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول کە تا ئەو کاتەی شەهید بوو دانەبڕابوو لە ڕیزی خەبات

و پێشمەرگایەتی دا. ئەوانەشی بە ژەهر خواردنەکە نەمردن و بە سەقەت و شەل و بریندار لێی دەرچوون و تا ئەو کاتەی کە چاك بونەوە کە خۆم لە هەمویان خراپتر بووم بریتی بوون لە: د. محمود علی عوسمان، سامی شۆڕش، عدنان موفتی، د. شوان، ئاوات و تریفەی خوشکەزام...

لە ١٤ ی مانگ بوو کە ئێمەیان برد بۆ ئێران و دوکتۆر فەرزان خەریکی چارەسەر کردنمان بوو، بەڵام تەجروبەیان لەسەر ئەم شتە و جۆری چارەسەر کرنی نەبوو. ئەو وەزعەی ئێمە بوو بە حەملەیەکی گەورە لە دژی ڕژێمی بەعس و لە دنیا دەنگی دایەوە و ڕێکخراوی لێبوردنی جیهانی (ئەمنستی ئینتەرنەشنال) دوایی ئێمەی بردە لەندەن کە ٣ کەس بوین: من و عدنان موفتی و سامی شۆڕش. کە ئەم دوو هاوڕێیەی دوایی ١١ ڕۆژ لە خەستەخانەی لەندەن بریج هۆسپیتال لە لەندەن مانەوە. بارودۆخی ئەوان وا بوو کە ئەو کاتەش ئەیان توانی بە پێی خۆیان هاتوچۆ بکەن، بەڵام بۆ من لە ناو فرۆکەکەش نەقالەیان بۆ هەڵواسیم، چونکە نەمدەتوانی دابنیشم.

پاش مانەوەی دوو مانگێك لە خەستەخانە وە دوو مانگی تریش بۆ چارەسەر کردنی هەندێ کێشەی تری تەندروستی وەك وەرزشی قاج و لەش (فیزیۆتێراپی). دوای نوژداری و زۆری کەش بەردەوام فیزیۆتەرەپییان بۆ دەکردم و هەولیان لەگەڵ ئەدام بە گوچان بڕۆم و بتوانم لەسەر پێ بوەستم. ڕێژەیەکی زۆر لە ژەهر لە میز و خوێنم دا بوو.

بەڕێز مستەفا چاوڕەش
لە نەخۆشخانەی لەندەن

لە ١٩٨٨/٥/٢٠ چومە هۆڵەندە، چونکە ئەو کاتەش لەوێ پەناهەندە بووم. بارودۆخێکی زۆر ناخۆش بوو: لە لایەکەوە دایکم شەهید بوو، ژن و منداڵەکەم لە بەندیخانەی (امن العامە) بوون، خۆم ئەو بەسەرهاتەم لێ ڕوو دابوو، ئەو هەموو هاوڕێ و دۆستانەم بەبەر چاوی خۆمەوە شەهید و برینداربوون وە لە ژیانی شاخ و شۆڕش و ترس دا بژی...

ئەو ڕژێمەی کە کوردستان و میللەتەکەی بە کیمیاوی و ژەهر و زۆر ئامرازی تر لە ناو دەبات، لە هەمان کاتدا ئێستە بەشێك لە خەڵکی ئەم وڵاتەی ئێمە کە باسی نیشتمان پەروەری دەکەن دەچن ئەو ڕژێمی بەعسە دێننەوە کوردستان و شاری هەولێری پێ داگیر دەکەن و دەیکەن بە گژ هێزی پێشمەرگەی کوردستان دا، و سوپای تورك دێننە سەر خاکی ئەم میللەتەی کە دوژمن خەریکی لەناو بردنیەتی، ئەوەش بەشێکی ترە لە تراژیدیای نەتەوەکەمان.

دوای ڕوداوەکە خەڵکی تر چوبو بۆ دائیرەی ئەمن لە سلێمانی و وتبوی کە من هەستاوم بە کردنی ئەو کارە هەر بۆ ئەوەی پارەی پێ وەربگرێت. (امن) یش بێگومان دەیان زانی کە خۆیان کێیان ڕاسپاردبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. ڕۆژی دوایی ئەو کەسەی تریان لە ژورێکی تر دانابوو وە نەرمینیشیان هێنابوو، ئەمیش جنێوێکی زۆری پێدابوو کە بە کابرای وتبوو تۆ چۆن خۆت دەکەیت بە خاوەنی ئەم شتە و من بەم کارە هەستاوم و کردومە.

ئەنجام دانی کارێکی لەم جۆرە بۆ ڕژێمی بەعس زۆر و گرنگ بوو کە قینێکی بێ وێنەیان لێمان بوو کە هەستاوین بە شۆڕش کردن کە ئەواتێکی نوێی بزوتنەوەیەکی نوێی گەلی کورد بووین.

پرسیار: تۆ خۆت یەکەم کەس بویت کە هەستت بەوە کرد کە ئەرمین حەویژ هەستابێت بەم کارە. ئەم ئافرەتە دوایی چۆن توانی دەرباز بێت بۆ شاری سلێمانی و لەوێوە بۆ بەغدا؟ ئایا مکافەئاتیان دایە بۆ ئەو کارەی کردی و لە کۆتایدا چۆن سزای گەل و شۆڕشی درا بە سەردا، چارەنوسی چی لێهات؟
وەلام: ئەرمین لای ئێمە شانۆگەرییەکی وای دروست کرد کە گوایە ئەویش ژەهر خوارد کراوە و بەبەر چاوی پێشمەرگەکان خۆی ڕشاندبوەوە. یەکێك بۆ شاهێد کاك شێرکۆی شێخ نوری کە ئێستە لە هۆڵەندیە و کاك ئەوزادی نوری بەگیش هەر بۆ شاهێدی مێژوو کە ئەویش هەر لە هۆڵەندیە کە من گومانی خۆم بە هەڵە نەگرتبوو. کاك شێرکۆی شێخ نوری وتی ئەرمین بکوژن و گومانەکە بەرامبەری زۆر ڕوون و تەواوە. ووتم با چاوەڕێ بکەین کاك مولازم عومەر بگەڕێتەوە. بیرم لێ کردەوە کە دوایی نەڵێن لەوانەیە ئەمە مەسەلەیەکی ئەخلاقی بێت و بڵێن دەیانەوێ بیشارنەوە و بیپۆشن.

من ئەو شەوە تا بەیانی بارودۆخم بەرەو خارپتر ڕۆیشت کە چوین دایکم بنێژین لە ئاوەژێ. لە ماڵی شەهید عبد الرحیم بە کاك ئەوزادی نوری بەگم ووت ئاگاتان لەم ئافرەتە بێت توشی موسیبەتێکتان نەکات کە ئافرەتەکەش خۆی هاتۆتە خوارەوە.

ئیتر من بۆ بەیانی ئەوێم بە جێ هێشت و بردمیان بەرەو شاخ ڕۆیشتین. تا نیوەی ڕێگا توانیم بە پێ بڕۆم لە نیوەی شاخ ئیتر کەوتمە ئازار و ڕشانەوە و خۆم بە پێوە نەدەگرت. گەیشتمە ئەشکەوتی بەرخان لە سەر شاخی ئاسۆس. لەوێ برادەران لە بن ئەشکەوتەکە ئاگریان کردبوەوە. مانگی ١١ بوو دنیا سارد بوو وە بەفر بە قەد پاڵی شاخەکەوە بوو. شێخ سەدرەدین بوو، شێخ دارای حەفید و هەندێکی تر بوو، بینییان من و کاک عومەر هاتوین و بە سواری ووڵاخ ڕەوانەم دەکەن بۆ ئێران. لەوێش بە کاک عومەرم ووت کە ئێستەش هەر گومانم لەم ئافرەتەیە کە ژەهر خواردی کردوین. هەستام کە دەستم قەڵەمی نەدەگرت، نامەیەکم بۆ مێردەکەی نوسی (جەبار) کە ئەو کاتە چوبو بۆ قەرەداغ.

بۆم نوسی وا من باسی بەسەرهاتێکی وات بۆ دەنوسم بە چەند دێرێك. کاك مولازم عومەر وتی ئەگەر جەبار نامەکە نەکاتەوە و ئەو ئافرەتە نەکوژێت ئەوا خۆمان دەیکوژین. نوسیم:

> "برای بەڕێزم کاك جەبار: بە هۆی خیانەتی ژنەکەی تۆوە بوە هۆی ئەوەی کە کاك بێستونی مەلا عومەر کە هاوڕێی چەند ساڵەتە شەهید بوو، وە شەهید بونی دایکم،وە خۆیشم چارەنوسم نادیارە. هیوادارم موعامەلە لەگەڵ ئەم وەزعە بکەیت، مانای کە بێتەوە بیکوژن".

من چەند ڕۆژێکم ویست، چونکە بە ناوچەی شەڕ و خراپدا تێدەپەڕین و بە یارمەتی چەند کەسێك بە ناو ناوچەی حکومەت

دا بردمیان تا گەیاندمیانە سەر سنوری ئێران. ئیتر من وەسیەتی خۆم نوسی و ڕۆیشتم.
ئیتر لەو ماوەیە کە کاك عومەر هاتبوە خوارەوە، هەندێك کەس ناتوانم بڵێم بە هۆی خیانەتەوە، بەڵام بە هۆی خوێڕێتی و نامەردیانەوە پاڵیان بە نەرمینەوە نابوو ڕۆیشتبوو وە کەڵکی لەو وەزعە وەرگرتبوو.

کە ڕۆیشتبوەوە سلێمانی هەر وەك باسم کرد دیارە پارەو خانویان دابویە. دیارە ئەم تەعدایە هەر لە مستەفا چاورەش و کەس و کاری من و ئەو هاوڕێیانەم نەکراوە بەڵکو لە میللەتی کورد کراوە.

ئەو هاوڕێیانەم کە لە ڕاپەڕینەکەدا بەشداریان کردبوو توانیبویان لە سلێمانی دەستگیری بکەن. من خۆم ئەو کاتە لە هۆڵەندە هەر لە ژێر عیلاج دا بووم. لەوێ ئیعترافیان پێ کردبوو وە دوایی کوشتبویان.
برادەران مێردەکەیان ڕەمی کرد، چونکە وتیان دیارە کە دەستی جەباری تیایە. ئیتر مێردەکەی ئیعترافی کردوە یان نا نازانم. بەڵام من خۆم وەك ویژدان دەڵێم لەوانەیە مێردەکەی ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبوبێت. بەڵام ئیتر لە بارودۆخێکی کوردستان و کاتی ئەنفال و...هتد لەوانەیە زۆر شتیش ڕوو بدەن ئیتر پێویست بوبێت یان نا.

پرسیار: ڕاستە کە دادگا کردنی نەرمین لەسەر کاسێت تۆمار کراوە.

وەڵام: بەڵێ تۆمار کراوە و من خۆم گوێم لێی بوە، بەڵام شریتەکە خراپ تۆمار کراوە. برادەران بردبویانە دەشت و لەوێ هاژەو ووژەی ڕەشەبا و ئەمانەی لەگەڵ تۆمار ببوو.

پرسیار: ئایا ئەو کاسێتە دەست دەکەوێت؟
وەڵام: نازانم چی لەو کاسێتە هاتوە. بەڵام ئەو کەسە خۆی ماوە و ئەگەر بە پێویستت زانی دەتوانم ڕوبەڕویت بکەمەوە و لە کوردستانە.

پرسیار: ٨ ساڵ دوای ئەو ڕوداوە تەندروستیت چۆنە؟
وەڵام: تەندروستیم لەدوای ئەو ڕوداوە قورسە هیچ کات وەك خۆی لێ نایەتەوە. هێزی جارانم نیە،و دەبینیت کە چاویلکە لە چاو دەکەم و دەرمان بەکار دەهێنم و ناو سکم هەتا ئێستەش هەر ناتەواوە و موزاعەفاتی پەیدا کردوە و ئازارم هەیە، بەڵام مەرجەکانی پێشمەرگایەتیم هێشتا لە دەست نەداوە و بەشی ئەوەی تیا ماوە، بەڵام تەئسیری خۆیشی هەر تێکردووم.

پرسیار: ئەو زەهرە چیە کە بەکار هێنراوە؟ چۆن دەست دەکەوێت، ئایا تایبەتە یان بە گشتی دەست دەکەوێت...؟
وەڵام: ئەوە پێی دەوترێ سالیۆم. بە کوردی خۆمان پێی دەوترێ دەرمانی مشك. کار لە جیهازی ئەعساب دەکات و هێزت تیا ناهێڵێت، کار دەکاتە سەر دەمار و هەمویان دەمرێنێت. [4]

ئێمە کە ١١/٢٤ توشی ئەو بەسەرهاتە بوین، لە ١٢/٢٠ /١٩٨٨ گەیشتمە خەستەخانەی لەندەن، و دوو مانگ لەسەر

[4]) ئەم زەهرە (سالیۆم) عونسرێکی قورسە، کە بێ تام و بێ بۆنە.

جێگا کەوتم و هەر لەوێ سێ مانگی کەش خەریکی چارەسەر کردنم بوون

پرسیار: ئایا گۆڕی ئەو شەهیدە نەمرانە هەر لە ناوچەی مەرگە بە خاك سپێردراون؟ چونکە لە بارودۆخی شۆڕش دا و لە خەباتی شاخ دا لەوێ بە خاکی کوردستان سپێردراون، ئایا لە بارودۆخی ئەمڕۆی باشوری کوردستان هەر لە شوێنی ڕوداوەکە ماون یان گوێزراونەتەوە ناوچەی نزیك کەس و کاریان؟
وەڵام: هەندێ لەو شەهیدانە برانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان. هەندێکی تریان نەبرانەوە. یەکێك لەوانە کە نەبرانەوە بۆ سلێمانی دایکم بوو، هەرچەندە خۆی خەڵکی سلێمانی بوو، من خۆم حەزم کرد نەیبەینەوە. ئەم شوێنە بوە شوێنەوارێکی مێژویی و سیاسی ئەو ڕوداو و شەهیدانە. من دوای ڕاپەڕین کە ڕۆیشتمەوە قەبری هەموو شەهیدەکانم هەڵبەست بە دایکمەوە و بە بێ جیاوازی. ئەوانەی کە لەوێ بوون شەهید عبدالرحيم بوو فەرماندەی لەشکرێکی خۆمان بوو، ئەو کاتە لە شەڕی تەق تەق لەگەڵ هێزی بەعس دا شەهید بوو.

کاك بێستونی مەلا عومەریان بردەوە بۆ سلێمانی و خەڵکی شار پێشوازیەکی گەورەیان لێ کرد. منیش دەمتوانی بە حوکمی دەسەڵات و لە چوارچێوەی لێپرسراوەتی خۆمدا شتێکی ئاوا بکەم، بەڵام ویستم ئەم شتە بۆ مێژوی کورد هەتا هەتایە بمێنێت و هەر کەسێك بە لای ئەو گۆڕانەدا بڕوات دەڵێت

شەهید بێستونی مەلا عومەر

ئەمانــەش لــەو شــەهیدانەن کــە بــە نەخشــەی ڕژێمــی بــەعس و خائینانی کورد بە زەهری سالیۆم کوژران.
ئێستە لە دێی ئاوەژێن گۆڕەکانیان هەڵبەسراوە و هەر لەوێش ماونەتەوە.

---

کاك مستەفا چاوڕەش پێناسـەی سیاسـی و جوگرافـی ناوچەکـە بەم شێوەیە دەکات:

" ناوچەی مەرگە ناوچەیەکی شاخاویە کە دەکەوێتە دامێنی شاخی ئاسۆس، دیوی ئەودیوی شاری قـەڵادزێ یـە، بـەری ئەوبـەر ئاوەکە شاخی ئاسۆسـە، دەکەوێتە پشـتی دوکانـەوە، مقـەڕەکانی سەرکردایەتی دوای گفتوگۆکەی یەکێتی لەگەڵ بەعس دا لە ساڵی ١٩٨٤ لەوێ بـوو، هـەر لـەو ماوەیـەدا دەسـت کـرا بـە دروست کردنی خـانوو، مەکتـەبی سـەرکردایەتی و مەکتـەبی سیاسـی هاتـە ئەم ناوچەیە. کە شـەڕەکە لێرە توند بوو لـە ژێر تۆپ بـاران دا گواستیانەوە. ئێمـە مقـەڕەکانمان لە بنـاری شـاخی ئاسـۆس بـوو. مقـەڕی ئێمــەش بـە تـەواوی لـە دێـی سـێڕوان بـوو. سـێڕوان بـە تەواوی دەکەوێتە نێوان دێی کانی توو، و مەرگە. کاتێك دەگەیتە کـانی تـوو لـە بنـاری شـاخەکە دوا دێ یـە. چنارتـا، سـێڕوان، ئاوەژێ، لۆتەر و مەرگە.

لـەو ناوچەیـە مەرگـەی پـێ دەڵێن. (لـە زەمـانی نـوری سـعید دا مەرکەزی ناحیە بوە؟) ئێستە سـەر بـە ناحیـەی بنگردە. بە دیوی ئەودیویشدا دەکاتە ناوچەی کەلالە و سـەفرە و زەروێ و نزیك لـە سنوری ئێران دەبێتەوە". ئەوە ئەو ناوچەیـە بوو کـە ڕوداوەکـەی ئێمەی تێدا بوو.

## (٥)

## گێڕانەوەی تراژیدیاکە لە دیدەی
## کاك د. مە حمود علی عوسمان (سۆرانی)

ڕژێمی سەدام حسێن کە هەمیشە لە دژی گەلی عێراق بە گشتی وە گەلی کورد بە تایبەتی هێزی بەکار هێناوە. جگە لە ئامرازی شەڕ بە هەموو جۆرە چەکێکی تری کوشندە وەك چەکی کیمیاویشی بەکار هێناوە، وە جگە لە وێران کردن و سوتاندنی کوردستان وە لە ناو بردنی دانیشتوانی کە لە چەندین ساڵەی شەڕی جینۆسایدی بەرامبەر میللەتەکەمان بەردەوام بووە، ژەهریشی بەکار هێناوە بۆ لە ناوبردنی دژەکانی لە کورد و عەرەب وە کەمایەتیە نەتەوایەتیەکان.

ئێمە کۆمەڵێکی دوانزە کەسی بووین لە دەعوەتێکدا کە هەموومان لە هەمان خواردنمان خوارد. ژەهری (سالیۆم) مان درایە کە کرابوە ناو خواردنەکەوە، بە تایبەتی لە ناو ئەو ماستاوەی کە لەگەڵ خواردنەکە دانرابوو وەك لە دواییدا دەرکەوت.

ئەم ڕوداوە، یان باشتر بلێین ئەم تاوانە پڕ مەترسیەی ڕژێم لە ڕۆژی ١٩٨٧/١١/٢٤ لە ناوچەی سێڕوان کە ئەکەوێتە پشت دوکان و مەرگەوە بە ئەنجام گەیەندرا، لە بارەگایەکی پێش مەرگە.

ئەو ڕۆژە ئێمە هەموومان لەو ناوە بوین و شەڕێکی گەرم هەبوو لەسەر شاخەکان لەگەڵ هێزەکانی ڕژێمی عێراق، وە چونکە چەندین بریندار هاتبونە خوارەوە بۆ نەخۆشخانەکە و هەندێکیش شەهید بوبون، لەو کاتەدا کاك عدنان مفتی وە من کە لە

بارەگای حزبی ئیشتراکیەوە هاتبوین (نیو کاتژمێر لە سێروان دووربو بە پێ)، لەگەڵ برادەرانی یەکێتی ئیشتمانی لە بەخاك سپاردنی شەهیدەکان بەشدار بوین وە من سەری تەخۆشخانەکەم دا بۆ تەماشا کردنی بریندارەکان وەکو پزیشکێك.
هەر لەو کاتەدا بە شێوەیەکی هەمیشەیی فڕۆکەی جەنگی عێراقی کە لە جۆری پیلاتوزی سویسری بوون لە ئاسمان بوو بۆمباردومانی دەکرد.

لەبەر ئەوە بە ڕۆژ نەگەڕاینەوە بارەگای خۆمان و نیوەڕۆ نانمان لە سێروان خوارد. خۆشبەختانە من هەموی سێ کاتژمێرێك بوو نانی بەیانیم خواردبوو. نان و ماستاوم کەمتر خوارد و ئەمەش ئەشێت تا ڕادەیەك تەئسیری هەبوبێت لەوەی کە لەناو نەچوم وەکو سێ کەسی تر کە لە گەڵمان نانیان خوارد و هەمان ڕۆژ ژیانیان لە دەست دا یان هەندێکی تریان کە چارەسەر کردنیان لە منی زیاتر خایاند.

من لەبەر ئەوەی تازە بە سوریەدا گەڕابومەوە کوردستان و خەریکی هەول دان بووم بۆ دامەزراندنی بەرەی کوردستانیی لەگەڵ حیزبی سۆسیالیستی خۆمان وە برایانی حیزبەکانی تر، لە ڕاستیدا لەگەڵ ئەوەش دا ئێش و ئازارم زۆر بوو، و تا ڕادەیەکیش مەترسی هەبوو لەسەرمان، بڕیارم دا کە لە کوردستان بمێنمەوە وە نەچمە بەریتانیا بۆ چارەسەر کردنم. وە لەبەر ئەوەی خۆم پزیشکم ئیتر ئەوەندەی زانیم و فێری بووم لێرە و لەوێ، و بە هۆی دەرمانی تایبەت بەو ژەهر خواردنەوە کە لە کوردستان و عێراق و وڵاتی دەوروبەرمان دەست کەوتن، وە یان کە زۆر درەنگ لە ئەورووپاوە لە لایەن ئەو برادەرانەی

خۆمان که چوبون بۆ عیلاج پێم گەیشت. چارەسەری خۆم کرد و ئەم چارەسەرە نزیکەی پێنج مانگی خایاند بە بەردەوامی. لەو ماوەیەدا ئێش و ئازارم زۆر بوو، خواردنم زۆر کەم بۆ دەخورا،و هەر بەم شێوەیەش نوستنیشم تەواو نەبوو. جگە لەوە بە هۆی ژەهرەکە و بە هۆی چارەسەرەکەشەوە (دەرمانەکان) مووی سەر و هەموو شوێنێکی تری لەشم تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر هەڵوەری، و قورسایم نزیکەی ١٠ کیلۆ کەمی کرد، پێستم زۆر زۆر ناسك ببوو پاش عیلاجەکە و بە هۆی ژەهرەکەشەوە پێستی سەرم ئاوسابوو. چەند جارێك سەرم سفر کرد بە گوێزان تا وردە وردە موەکانی هاتنەوە.
لە ڕاستیدا تاقی کردنەوەیەکی زۆر سەخت و پڕ مەترسی بوو کە ئێش وئازاری میللەتی دەرئەخست لە دەست ئەم ڕژێمە، وە جارێکی تریش دڕندەیی و پیاوکوژی بێ هاوتای ڕژێمی سەدام حوسێنی بیر خستینەوە کە ئەمە بەشێکی یەکجار کەمی بوو.

ئەم ژەهرە (سالیۆم) لە بناغەدا (مەرگەموش)ە کە بۆ کوشتنی جرجی گەورە بەکاردێت، بەڵام ڕژێمی عێراقی بە هاوکاری زۆر کارشناسی بێگانە وایان لێ کردبوو کە وەکو ئاو یان پاودەرێکی زۆر سادەی لێ بکەن، وە بە ئاسانی بەکار بێت لە ناو خواردن یان خواردنەوەدا بۆ لە ناوبردنی ئەو نیشتمانپەروەرانەی کە دژی ڕژێمی بەغداد خەبات دەکەن و دەجەنگێن. لەبەر ئەوەی هەندێك کەس لە دەرەوە چارەسەر کران لە مەسەلەی (ژەهراوی کردن بە سالیۆم) وە هەندێکیش لە دەرەوە وەفاتیان کردبوو، لەبەر ئەوە لە دەرەوە تا ڕادەیەك ئەم ژەهرە ناسرا بە ناوی (ژەهری عێراقی)، بەڵام لە ڕاستیدا زانیاریەکی وایان نەبو لە دەرەوە لە نەخۆشخانەکان لەسەر چۆنیەتی تەئسیر کردنی ئەم

ژههرە لە مرۆڤ و ڕادەی کوشندەیی، چونکە زیاتر زانیاریەکە لە کارکردنی لە جرج و گیان لەبەری تر هەبوو، و زۆر کەم کەس بڕوای ئەکرد کە دەولەتێك هەبێت ئەم ژههرە دژی هاوولاتی خۆی بەکار بهێنێت.

من لە کۆتایی سالی ١٩٨٨ کە لە ئەمریکا بووم چوومە نەخۆشخانەیەکی ناسراو لە ولایەتی نیویۆرك بۆ ئەوەی بزانم ئایا پاشماوەی ژههری سالیۆم لە لەشم ماوە. دکتۆرەکان سەریان سوڕمابو لەوەی من سالیۆمم خواردبێت و زانیاری وایان نەبوو لە کارکردنی لە مرۆڤ وە چۆنیەتی چارەسەر کردنی، یان گۆڕینەکانی کە بەسەر ئەو مرۆڤە دێت ئەگەر نەمرێت. هەموو لێم کۆبونەوە و داوایان لێ کردم کە محازەرەیەکیان بۆ بدەم لەسەر ئەم ژههرە و چۆن خواردمان و چۆن کاری تێ کردین و ئەوانەی وەفاتیان کرد چی وە چۆنیان لێ هاتبوو.
باسی ئەوەی کە ئێمە چۆن چارە کراین و چاك بوینەوە!! باس کردنەکەی منیان زۆر لا بە سود بوو، وە بۆیان دەرکەوت کە ڕژێمی بەغداد چەند دڕندەیە. منیش ئاگادارم کردن کە واشنتن بە تەواوی پشتی ئەم تاوانبارە گەورانە ئەگرێت کە لە بەغداد کار بەدەستن.

## نەرمینی عەلی حەویز و وەفاتی هاوڕێیان

کاک د. مه حمود: مەسەلەی نەرمین حەویز دیار بوو کە گومانی لێ کرابوو وە هەروەها دیار بوو بە زۆر دەیویست خۆی بڕشێنێتەوە. شانۆگەریەکی وای دەکرد کە گوایا ژەهری خواردوە.
چۆن گیرا و بەردرا و ڕۆیشت من زانیاری تەواوم لە سەری نیە. زیاتر لەوانەیە کاک مستەفا چاوڕەش کە ئەو ژنە لە ماڵیان بوو وە خۆی لێپرسراوی ئەو ناوچەیە بوو بزانێت، یان برادەرانی یەکێتی نیشتمانی کە ئەو ناوچەیە لە ژێر دەسەڵاتیاندا بوو.*
ئەوانەی کە هەر ئەو ڕۆژە وەفاتیان کرد سێ کەس بوون. پیاوێك و دوو ژن کە یەکێکیان دایکی کاك مستەفا چاوڕەش بوو، و ئەوی تریش (سریعە) ی ناو بوو خەڵکی ناوچەی مەرگە

*)سەبارەت بە نەرمین لە دەرەوەی وولات کاسێتێکم بە دەست کەوت کە دوای دەستگیرکردنی لە ڕاپەرینەکەی خەلکی شاری سلێمانی ددان بە کارەکەیدا ناوە و تۆمار کراوە، بەلام وتوێژەکە لەگەلیدا هەر کاتی خۆی ئەوەندە خراپ تۆمار بوە کە بە داخەوە نەمتوانی لە ناوەڕۆکەکەی بە باشی بکەم و بیخەمە سەر کاغەز بۆ مەبەستی ئەم کتێبە. بە دەنگێکی هێواش و ترسەوە دەلێ کە من ئەم کارەم کرد و تاوانبارم،و تەواو دیارە کە زۆر دڵنیایە لەوەی کە مردن چاوەڕێی دەکات و هیچ کات ئەوەندە نزیك نەبوە لێی وەك ئەو کاتەی دوا وتووێژی ژیانی و تۆمار کردنی تاوانەکەی.
لە ڕاستیدا لەبەر فاکتەری تێگەیشتن لە ڕوداوەکانی ئەو سەردەم و قۆناغە،و بۆ تێگەیشتن لە سروشتی مرۆڤ بۆ بە ئەنجامدانی نەخشەیەك، یان ڕەفتارێك پێویست بوو کە زیاتر سەبارەت بەم ئافرەتە بزانم، کە لەبەر دوریم لە وولاتەوە و دوور بونم لە سەرچاوەی کۆکردنەوەی ڕودا و و ڕاستیەکان لە ئەم شوێنەی نوسینە لێرەدا بۆشاییەك بە خۆیەوە دەگرێ.

بوو. له ڕاستیدا ئێمه شاهێدی وەفاتی کاك بێستونی مەلا عومەر و خوشکه سریعه بوین، چونکه دایکی کاك مستەفا لەو کاتەدا که ئەیان بردەوه بەرەو سلێمانی له ڕێگا وەفاتی کردبوو.
ئەو ژەهره کار له هەموو لەش دەکات، و نیشانەکەی له هەموو لەشدا (هەموو ئۆرگانەکان) دیاره و ئەوەی ئێمه بینیمان بە تایبەتی له کاك بێستونی مەلا عومەر که له هەموو یەکێکی تر زیاتری خواردبو زۆر ترسناك بوو، چونکه جگه لەوەی که به پەله بەرەو بێهۆشی چوو. پەلەقاژێ و خۆجولاندنی وا بەهێز بوو که به چەند کەسێك نەدەگیرا، و هەموو لەشی ڕەق بوبو. ئەمە جگه لەوەی که کاری دڵی زۆر تێك چوبو وه هەروەها هەناسەدانیشی.

ورده ورده چاوی تاریك بوو، وه له ماوەیەکی زۆر کەم که نزیکەی کاتژمێرونیوێك بوو، پاش نارەحەتیەکی یەکجار زۆر هەموو ئۆرگانەکانی لەشی له کار کەوت و وەفاتی کرد و جێگای داخێکی گەوره بوو بۆ هەموومان به جیاوازی بیروڕاشمانەوە، چونکه تا بڵێی کادر و پێشمەرگەیەکی چاك و دلسۆز و ڕێك و پێك بوو، و له ڕاستیدا جێگای شانازی بوو. ئێمه له ڕاستیدا لەو وەزعەی کاك (بێستون) هوه زانیمان که مەسەلەکه ژەهره. له پاش وەفاتی کاك بێستون ورده ورده نیشانه دەرکەوت له خوشکه سریعەش، که ئەویش دیار بوو زۆری له ژەهرەکه خواردبوو. چەند کاتژمێرێکی خایاند و ئەویش وەفاتی کرد.

نیشانەکانی ئەمیش وەك ئەوەی شەهید بێستون وابون، بەڵام بەو توندیەی ئەو نەبوو وە کاتی زیاتر ویست هەتا دەرکەوتن، وە بونە هۆی وەفات کردنی ئەو خوشکەش کە دوبارە جێگای داخی هەموو لایەك بوو، چونکە یەکجار دلسۆز بوو بۆ خزمەت کردنی پێشمەرگە و کار کردن بۆ شۆڕش.

دایکی کاك مستەفا چاوڕەش ڕەنگە کەمتری خواردبێت و نیشانەشی کەمتر بوبێت، ئێمە نەمان بینی کە وەفاتی کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی بە تەمەن پیر بوو وە وەکو دوەکەی تر گەنج نەبوو بەرهەڵستی بۆ ژەهرەکە کەمتر بوە و ئەویش ئەو ڕۆژە بۆ شەوەکەی زۆر بە داخەوە وەفاتی کرد.

ئەم کارەساتە کە لەو نیشانانەی بینیمان چ لەوانەی وەفاتیان کرد وە چ لەوانی تر کە پاش ماوەیەکی درێژ لە چارەسەر کردن چاك بونەوە کە من یەکێك بووم لەوانە زیاتر دڕندەیی و دژایەتی ڕژێمی سەدام حسێن بۆ مرۆڤایەتی بۆ دەرخستین، هەروەها هی ئەو دەوڵەتانەی دەرەوە کە ئەم کۆمەکانەیان بۆ دەکرد، چ کیمیاوی وە چ ئامادە کردنی ژەهر بۆ لە ناوبردنی خەڵك کە خەباتیان ئەکرد دژی ئەم ڕژێمە، وە هەروەها لە بە کارهێنانی ئامرازی ئەشکەنجە دان، ئەو دەوڵەتانەی کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان تێدا بوو، و ئەیان زانی سەدام و ڕژێمەکەی چەند دڕندەیە و ئەم کۆمەکانە چۆن تەنها بۆ لە ناوبردنی کورد بە تایبەتی و ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیش بەکار دەهێنن. ئەمەش دەری دەخات کە کاتێك بەرژەوەندی دێتە پێشەوە هەموو جۆرە

سەرەتاو مافێکی ڕەوا دەبێتە قوربانی ئەم دەسەڵاتانە بە شێوەیەکی دووریش.

لە هەموو ڕەوتێکیشیاو وە هەموو دادپەروەریەك، یان مافی مرۆڤ کە ئەو دەوڵەتانە وە بە تایبەتی ئەمریکا زۆر باسی دەکات. هەروەها ئەم ژەهر خواردنە وەکو هەموو تاوانە گەورەکانی ڕژێم جارێکی تر دەری دەخات کە ئەم ڕژێمە هەر پیشەی لەناو بردنی دژەکانیەتی بە هەموو جۆرێك و شێوەیەك کە زۆر جار لە جیهاندا بێ هاوتایە. وە بڕوای بەوە نیە کەس بیروڕای جیاواز یان دژی هەبێت و ئامادە نیە بۆ گفتوگۆی ڕاستەقینە و دیموکراتی لەگەڵ کورد یان ئۆپۆزیسیۆن.
بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد زیان بەخش و بێ ئەنجامە بە تایبەتی ئەگەر لایەنێك بە تەنیا کردی و نهێنیش بوو، و گەلی کورد ئاگاداری نەبوو. [٦]

د. محمود سۆرانی

---

[٦] ئەم وتوویژەم لەگەڵ کاك د. محمود علی عوسمان بە ڕێگای تەلەفون و فاکس ئەنجام داوە، و خۆی ئێستە دانیشتوی بەریتانیا- لەندەنە.

## (٦)
## گێڕانەوەی تراژیدیاکە لە دیدەی کاک عەدنان موفتیەوە

لە ساڵی ١٩٨٨ ئیمە بریارمان دابوو لەناوچە ی سیروانو یاخسەمەر بەواتە لەناوچەی سەرکردایەتی یە کێتی نیشتمانیی کوردستان بارەگایە ك بکەینەوە ئەوکاتە کەسە ر بەسۆسیالیست بووین. پاش گفتوگۆیەکی زۆر لەگەڵ مەکتە بی سیاسی ی.ن.ك بریاریان دا لە ناوچەی سیروان بیکەینەوە. پێشتر کە گەیشتینە ناوچەکە جەباری عەلی حە وێز کە مێردی نەرمین بوو ئەو ژنەی کە ژەهرەکەی بۆ کردینە ناو خواردنەکەوە. جەبار کاتی خۆی لە سالانی ١٩٧٨، ١٩٧٧ پێشمەرگە بوو لای سۆسیالیست. پاشان چووە لای یەکێتیی نیشتمانی. لە دەوروبەری ساڵی ١٩٨٤ گیرابوو . ماوەیەك دوای ئە وە لە بە ندیخانە ئازاد کرا.

ئەم ئازاد کردنە دیار بوو کە مساوەمەیەك بوو لەگەڵ ژنەکەیدا نەرمین ماوەیەك بوو هاتوچۆی دامودەزگای موخابەراتی عێراقی دەکرد. کەجەبار ئازاد کرا هاتە دەرەوە و لە ناحیەی مەرگە دائەنیشت و لەماڵەکەی خۆی دەعوەتی کردین. ئیمە هەستمان بەهیچ شتێکی نائاسایی نەکرد. پاشان جەبار گواسترایەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ و ژنەکەشی ناردەوە بۆ سلیمانی لەسەر ڕۆشنایی ئەوەی

کەجەبار لەوێ نەماوە ،بەلام نەرمین هەر دوای دوو ڕۆژ گەڕایەوە بۆ ناوچەکەو چوە ماڵی کاك مستەفا چاوڕەش. ئەو کاتە مەسەلەکە سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا کەبۆچی نەرمین گەڕاوەتەوە بۆ ئەوێ. لەئەنجامی باروودۆخی شەڕ چەند شەهیدێك هەبوون کەبەیاتییەکەی بڕیار وابوو بیان نێژین و بڕیاریش وا بوو سەردانی بریندارەکانیش بکەین هەر لەناوچەی سیروان. هەر ئەو ڕۆژە کاك سامی شۆڕشیش هاتە لامان. لەڕێگا کە کاك مستەفامان بینی پێی ووتین کە شەهیدەکان بۆ نیوەڕۆ ئامادە دەبن بۆ ناشتن. وتی لەبەر ئەوە بۆ نیوەڕۆ لای خۆمان نانی نیوە ڕ ۆ دەخۆین. دوای سەردانی خەستەخانە چووین بۆ ماڵی کاك مستەفا ، کەچووینە ئەوێ نەرمینیش لەوێ بوو. لە سەر ڕۆشنایی ڕوداوەکە قەناعەتم وایە کە ئەم ژنە دەمێك بێت لەگەڵ موخابەراتی عێراقی دەستی تێکەڵ کردبێت. دیار بوو پێشتر لەو ژەهرەی بۆ کاك مستەفا کردبووە خواردنەوە.

جاروبار ئازارێکی سکی هەبوو، بەلام نەیدەزانی کە هۆکەی ئەوەیە،هەندێك لەبرادەرانی تریش تووشی هەمان دیاردە بووبوون. دیاربوو کە پێشتر ڕێژەیەکی کەمی لەو ژەهرە کردۆتە خواردنەوە . کاتێك کەدامودەزگای موخابەراتی عێراقی سەرنجیان داوەتە ئەوەی کەنەرمین دەتوانێت دەستی بگاتە برادەران دووبارە ناردوویانەتەوە دەرەوە بۆ بەئەنجامدانی هەمان کردەوە،بەلام ئەمجارەیان ڕێژەیەکی زۆرتر لەم ژەهرە کوشندەیە بکاتە ناو خواردنەوە. جارەکێك پێش کاتژمێری دوانزە بوو

کەدەستمان کرد بەنان خواردن کەژمارەمان دە کەسێك دەبوو. پاش نانخواردنەکە ویستمان بڕۆین بۆ سەر قەبران. لەکاتژمێری یەکی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ. لەگەڵ گەیشتنمان بۆ ئەوێ بێستوونی مەلا عومەر لەئوتومبیلەکە دابەزیو کەوت. من سەریم بەرزکردەوەو هەندێك شێلام. ئەو کاتە وای بۆ دەچووم کەتوشی سەکتەی دڵ بوو بێت دوایی گەڕاینەوە بۆ خەستەخانەکە. کە گەیشتینە ژووری خەستەخانەکە ڕشایەوەو بۆنێکی زۆر پیسی لێوە دەهات. دکتۆر شوان هات و سەیری کرد. ئەمیش هەر بڕوای وا بوو کەتووشی سەکتەی دڵ بووبێت. لەکاتژمێری دوو چارەك کەم سەریعەی مەلا موحەرەمیشیان هێنایە خەستەخانەکە. سەریعە لەبنەماڵەیەکی تێکۆشەر بوو، یارمەتی دایکی کاك مستەفای زۆر ئەدا بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری پێشمەرگە. کەمن سەریعەم بەم بارودۆخە بینی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو قەناعەتە چووم کە ژەهر خوارد کرابین.

لەناو ئەم قسانەدا بووین سەریعە هاواریکی لێ هەستاو کەوت، هەڵیان گرتوو بردیانە ژوورەکەی تر. کەچوومە لای ئەبینم ئەویش ئەڕشایەوە، نیشانەکانیان هەموو وەك یەك وا بوون. هەتا ئەوکاتەش هەندێك لەو برادەرانە قەناعەتیان وا نەبوو کەژەهر خوارد کرابن. لە کاتژمێری سێ وچارەك کاك بێستوون زۆر بەعەزابەوە وەفاتی کرد. لەو دوو کاتژمێرەدا تەنیا یەکجار چاوی کردەوەو تەماشای من و دکتۆر مە حمود عوسمانی کردو پێی ووتین من زۆر خەجاڵەتم کە ئێوەشم وا بەخۆمەوە مەشغوڵ کردووە. من

ئەم قسەیەم هەرگیز لە بیر نەچووەتەوە. لەکاتژمێری چوار چارەك کەم دایکی کاك مستەفاشیان هێنا. من بەردەوام لەو قەناعەتەدا بووم کە ئێمە ژەهر خوارد کرابین، بەڵام دکتۆر مە حمود و دکتۆر شوان بەردەوام ڕەفزی ئەوەیان دەکرد کە ژەهرخوارد کرابین. ماڵێکی ملازم عومەر لەپشتەوە بوو کەسەفەریان کردبوو، و کەسی لێ نەبوو من چوومە ئەوێ هەولم دا کە بڕشێمەوە. دەستم کرد بەقوڕگمدا بەلام بێ ئەنجام بوو. کەدایکی کاك مستەفایان بەسەر ولاخەوە هێنا دەڕشایەوە. چوومەوە ئەوی و پێم وتن کەئەوە بوونە سێ کەس. ئینجا قەناعەتیان بەقسەکەم هێنا. لەو بەینەدا سەریعەش مرد. دوایی گەڕاینەوە بارەگاکە و دڵی خۆمان پەوە خۆش دەکرد کە لەوانەیە ئێمە لەو ژەهرەمان نەخواردبێت. ئیتر نازانم کە کاریگەری بۆ سەر ئێمە کەمتر بووە لەوەدا بووبێت کە ئێمە کەمترمان خواردبێت لێی یان لەشمان بەرهەڵستی زۆرتر بووبێت. من تەنانەت پەرداخ و نیوێکم ماستاو خواردەوە. لەوانەیشە ژەهرەکە زۆرتر لەبنی ماستاوەکە نیشتبێت. بێستوون ماستاوی بۆ هەموومان تێ کردو دواپەرداخی بۆ خۆی تێ کرد. شەوێ من و دکتۆر مە حمود و سامی شۆڕش لەخەو هەڵدەساین و سەیری یەکترمان دەکرد کەبزانین ئایا کەسمان لێ نەمردووە. برادەرێکی تریش کاك ئاوات ئەویش لەو ژەهرەی خواردبووەوە. برادەرێك کەناوی دلاوەر بوو لەکاتژمێری شەشی بەیانیدا بانگی لەمن و دکتۆر مە حمود کردو وتی هەستن ئەوا لەڕێگادا بەرەو سلێمانی دایکی کاك مستەفاش مرد. دووبارە وەزعێکی دەروونی زۆر ناخۆش

بالّی کێشایەوە بەسەرماندا. بۆ بەیانییەکەی کەویستمان دایکی کاك مستەفا بنێژین، کاك مستەفاش وتی ئازارم هەیە. ئێمەش پێمان وت کە تۆ پێشتریش ئازارت هەبووە. باشتروایە هەتا ڕێگا نەگیراوە سەفەری ئێران بکەیت، چونکە سەرما دەستی پێ کردبوو، و بۆنی بەفر دەهات. ئەومان بەڕێ کردو خۆمان گەڕاینەوە. کات بوو بە کاتژمێری دوانزە.

لەڕێگا هەستم کرد کە پەنجەکانم و پێم سر بوون هەروەك بیست سەعات بەپێ ڕۆیشتبم و عەرەقەی کردبێت. لەڕاستیدا قسەم نەکرد، وتم نەوەك بڵێن ئەوە شتێکی نەفسیە. چووم دەست وپێم شت و نزیکەی کاتژمێرێك دانم بەخۆمدا گرت. هەستم دەکرد کە ئازارەکە بەرەوسەرەوە دێت. ئیتر ناچاربووم کەباسی بکەم و بڵێم لەوە دەچێت کەمنیش لەو ژەهرەم خواردبێت. دواتر هەوڵی ئەومان دا کەبچین بۆناوچەی پاخسەمەر، چونکە ئەو کاتە لەو ناوچەیە نەخۆشخانەی لێ بوو. دوای چوار سەعات ڕێگا گەیشتینە پاخسەمەر،چووینە خەستەخانەکەی سەرگەڵو، دوای ئەوەی لەلایەن پزیشکەکانەوە تەختیتی دڵیان بۆ گرتین و فەحسی خوێنیان بۆکردین هیچمان لێ ئاشکرا نەبوو، دواتر چووین بۆ خەستەخانەکەی حزبی دیموکرات، وتیان دکتۆری فەرەنسی لێیە، بەڵام دکتۆرە فەرەنسی یەکان ڕۆشتبوون. هەر لەوناوچەیە خەستەخانەیەکی کۆمەڵەی لێ بوو کە کۆمەڵێك دکتۆری ئێرانی باشی لێ بوو ئەوانیش فەحسیان بۆ کردین،بەڵام لێیان نەئەزانی. بەڕێکەوت کتێبێکی پزیشکی

جیهانی لەوێ بوو کەساڵی جارێك دەردەچێ و هی ساڵی ١٩٨٧ بوو، لەو کتێبەدا بەدوای وەسف و نیشانەکانی ژەهردا دەگەڕاین، هەموو جۆرە ژەهرێك تیایدا نووسرابوو کاریگەری چیە. نیشانەی نەخۆشییەکەی ئێمە لەگەڵ ماددەی کوشندەی سالیۆم یەکی دەگرتەوە .بەوەدا بۆمان ئاشکرا بوو کەژەهری سالیۆممان دەرخوارد دراوە. ئەوەی ڕاستی بێت ئێمە پێش ئەوەی بگەینە لای دکتۆرەکان، دەتوانم بڵێم بۆ یەکەمجار هەستم کرد کە گیان دەرچوون چۆنە. شەوێك لە ماڵی دکتۆر فوئاد نووستبووم ،بە یانییە کەی زۆر زوو بە ئازارێکی یەکجار زۆرەوە بەئاگا هاتمە وە وەکو شتێك لەتەوقی سەرمەوە لێم بدات لەبنی پێمەوە دەربچێت. لەپاشدا سەیرم ئەکرد ڕۆژبەڕۆژ ئازارم زیاد ئەبێت. دکتۆر مە حمود و کاك سامیش هەر لەگەڵم بوون و هەتا ئەو کاتە ئەوان ئازاریان لێ دەرنەچبوو. یاخود هێشتا کەمتر هەستیان بە ئازار دەکرد بە تایبەتی د. محمود. بیرمان کردەوە بچین بۆ ئێران،بەڵام بەفر ڕێگای گرتبوو، ئەو ڕێگایەی کە کاك مستەفا لێوەی ڕۆشتبوو نەمابوو. بڕیار درا من و کاك سامی بچین، چونکە هێشتا وەکو باسم کرد دکتۆر مە حمود نەخۆش نەکەوتبوو. ئەو گەشتەمان دەستی پێ کرد و هەتا گەیشتینە ئێران دەتوانم بڵێم کە نووسینەوەی بۆ داستان دەست ئەدات. تاکە ڕێگا کەبەدەستمانەوە بوو بۆ دەرچوون موجازەفەکردن بوو بەڕۆح چونکە دەبوایە بەناو هێزەکانی حکومەتدا گوزەر بکەین. بۆ ئەم مەبەستە چەکدارە کوردەکانی سەر بە حکومەت هاوکارییان کردین کەزێر بەزێر سەر بە

ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی بوون، کاک مولازم عومەر تەرتیبی کردبوو ،بەڵام خۆشترین شت ئەوەیە کەچووینە ناو جەیشی عێراقی بۆ ئەوەی بتوانین بچین بۆ ئێران. ئەوی ڕاستی بێت ئەو ڕێگایە چەندە بڵێی سەخت و ناخۆش بوو ،سەرماو بەفرو باران و خەتەری زۆر... بەڵام لەبەر ئازار ئێمە ئاگامان لەهیچ نەبوو، لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێك وێنە هەیە کەقەت لەبیرم ناچێت. یەکێك لەوانە ،کاتێك کەڕۆشتین و گەشتینە دوا بازگەی چەکدارەکان(جاشەکان)ی حکومەت، منیان هەڵگرت و درێژیان کردم ،لەناویاندا پیاوێکی بەتەمەنی تیابوو نزیکم دەکەوتەوەو دەهات و دەچوو ،و لێم ورد دەبووەوە، لەدواییدا هاتە پێشەوەو وتی تۆ عەدنان نیت؟ وتم بەڵێ ئەوم. کەسەیرم کرد فرمێسك بەچاویدا ئەهات وەدە ستی بە گریان کرد. کەبینیم، هەستم کرد کە حاڵم خراپە. خۆی پێشتر پێشمەرگەی لای خۆمان بوو کە دواتر تەسلیم بوەوە. بە هەرحاڵ هەرچۆنێك بوو گە یشتینە ئێران ،هیچ کام لە دکتۆرەکان نەیان دەزانی کە ئێمە چیمانە. کە گەیشتینە تاران یەکەم کەس کە زانی ئە و ژەهرە سالیۆمە، دکتۆرێکی خەستەخانەکە بوو، کە خۆی پسپۆری تایبەت بوو لە و بوارە دا کە دە ستی لە سەرمان دا ،پرچ وبرۆمان بە دەستیە وە هات و هەلدەوەری، پی ی وتین ئێوە مەرگە مووشتان خواردووە ،چونکە سالیۆم خۆی ژەهرێکە چڕکراوەی ئە و مادەیەیە کە پێی دەڵێن (مەرگە مووش).

لەتاران ماینەوە تا دواتر بە هۆی کاك عادل مورادو کاك سیامەند عوسمانی ئامۆزامەوە کە لە فەرەنسا بوو، ئەمنستی ئینتەرناشنالیان لە و مە سەلەیەی ئێمە ئاگادار کردبوو وئەمنستی تەبەننای مەسەلەکەی ئێمەی کردبوو. کاك مستەفا چاوڕەشیش لەتەورێزەوە گە پشتبووە ئەو خەستەخانەیەی کە ئێمەی لێ بووین. دواتر موعامەلەی ئەوەیان بۆ کردین کە بچین بۆ لەندەن. مانەوەمان لە لەندەن نزیکەی مانگێکی خایاند. عیلاجەکەمان هەر لەتارانەوە دەستی پێ کرد، بەڵام عیلاجێکی سادەو سەرەتایی بوو. دەرمانێکیان بۆ هێناین لەئەڵمانیاوە. دواتر کەپسولێکیان بۆ هێناین کەدژی سالیۆم بوو تازە دەرچووبوو، ئەوە پێش چوونمان بۆ لە ندەن بە چوار - پێنج ڕۆژ بۆیان هێناین.

ئەو کەپسولە ژەهرەکەی لە خوێنەکە دەمژی و فڕێی دەدا، بەلام من ئازارێکی ترم هەبوو بەهۆی قەبزیەوە، ئەو کەپسولە ژەهرەکەی لەخوێنەکە دەمژی و دەیبردەوە بۆ مەعیدە، دووبارە خوێنەکە دەیمژیەوە، منیش بەم هۆیەوە قەبزبووم. سەرلەنوێ مەئساتی ئازارو هاوارەکە سەری هەڵدەدایەوە. دواتر زەیت خەروعیان بۆ پەیدا کردم یەك دوو جار خواردمەوە تا ژەهرەکە لەسکم دەرچوو.
دەتوانم بڵێم کە لەم زروفەدا کاك ملازم فوئاد کە بەردەوام لە خەستەخانەکەدا بوو زۆر هاوکاری کردم. هەروەها پێویستە ئیشارەت بدەم بە یارمەتی پێشمەرگەی دلسۆز و قسەخۆش کاك جەلالی مینە یەگ کە لە ڕێگا بەردەوام لەگەڵماندا بوو.

تاکە شوێنەوارو کاریگەرێتی ئەو ماددەیە کە لە سەرم مابێتەوە تاکو ئێستا ئەوەیە کە وە کو هەست دەکەم تەئسیری لە ئە عسابم کردووە و جارجار ئەعسابم ساردە،هەست دەکەم بە دەنگە دەنگ زوو ئینفعال دەکەم وە کو جاران تەحەمول ناکەم. سەبارەت بە نەرمین حەوێز ئێمە سەرەتا گومانمان لە ناسیاوێکی کاک مستەفا کرد کە پێشتر خواردنی بۆ هێنابووین،کە مێکیش گومانمان لە نەرمیی کرد چونکە نەرمین تەنیا کەس بوو خۆی و منالّەکەی هیچیان لێ نەهاتبوو لەو مالّەدا، هەرچەندە ویستی دەورێکی کارەکتە رانە ببینێت،خۆی ڕشاندەوە و خۆی خستە حالّەتێکەوە، بەلام هیچی لێ نەهات و گومانمان کرد. دواتر هەلاّت. هۆی هەلاّتنەکەی بەڕای من دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ناوچەکە ناوچەیەکی تەماس بوو لە نیوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و هێزەکانی حکومەتداو بەتەواوی کۆنترۆلّ نەکرا بوو.

**بەرێز عەدنان موفتی پێش نەخۆشی و دوای نەخۆشی**

## (٧)

## گێڕانەوەی تراژیدیاکە لە دیدەی کاك سامی شۆڕش

ڕۆژی ١٩٩٧/١١/٢٤ لــە لای د. محمــود عوسمــان و کـــاك عەدنان موفـتی بـووم. بـەیانی یـەك ویستم بگەڕێمـەوە ناوچـەی ئیش و کارەکانی خۆم لە بەرگەڵوو. بـەڵام کـاك دکتـۆر و کـاك موفتی ووتیان واچاکە سەردانی کاك مستەفا چاوڕەش بکەین و ئینجا بۆ دوای نیوەڕۆ بچیتەوە بەرگەڵوو. ئەوان مقەڕاتیان لە دۆڵی مەرگە بوو.

هەرسێکمان بەیەکەوە لـە دەوری کـاتژمێر (١٠)ی پێش نیـوەڕۆ سەردانی کاك مستەفامان کرد. داوای لێ کردین کە بۆ نیوەڕۆ لای ئەو نان بخۆین و ئینجا لە مەراسیمی ناشتنی پێشمەرگەیەکی شەهید بەشدار بین.

ئەوە بوو کاتژمێر (١٢) نانی نیوەڕۆمان خوارد. لەسەر خوانی نـان خـواردن نزیکـەی ١٠ کـەس بویـن جگـە لـە د. مـە حمود و عەدنان و مستەفا چاوڕەش و من، شەهید بێستونی مەلا عومەر و دوکتـۆر شـوان و دلاوەرە قەڵـەو و هــەندێکی تـر کـە ئێسـتا ناوەکانیانم لە بیر نیە لەوێ بوون.

هـەروەها دایکی کـاك مسـتەفا و کچێکـی خزمـی و کچێکـی مـەلا محرەمـی مەرگـە لـە مەتبـەخ کاریـان دەکـرد. هــەر ئـەو بەیانیـە

ژنەکەی جەباری عەلی عەوێز لە مەرگەوە هات و چووە لای ژنان لە مەتبەخ.

ئەو ماوەیە شەڕ گەرم بوو لە گەلاڵەی ماوەتان و شاخی ژیلوان و دەوروبەری. شەڕ لە نێوان پێشمەرگە و عێراق لە لایەك و گەلە کۆمەکی عەسکەری لە بەینی عێراق و ئێران. بۆیە تەیارە بەردەوام لەسەر ناوچەکە بوو.

جگە لەمە، حکومەت ماوەیەك بوو دەستی کردبوو بە شەڕی ( المناطق المحظورة ) لە دژی پێشمەرگە. واتە خەریك بوو بە تۆپ و تەیارە و هێرش گوندەکان چۆل بکات و نەیدەهێشت کەس لە ناوچەکەدا جوڵەی هەبێ. لەو نێوانەدا، دەزگاکانی پێشمەرگە چاودێری ئەوەیان دەکرد حکومەت خواردنی ژەهراوی بنێرێ بۆ ناوچەی پێشمەرگە بۆ چاوترساندنی خەڵکی. بەڵام لە خەیاڵ نەبوو کە حکومەت ڕووبکاتە ناردنی ژەهر و تێکەڵاو کردنی بە خواردنی پێشمەرگەوە لە بنکەکانی خۆیاندا. بۆیە کەمتر خەڵك لە خواردنی لە ناوچەکانی پێشمەرگە ئامادەکراو دەترسان.
کاتژمێر ١٢ نان خورا لە ماڵی کاك مستەفا. دواتر چووینە قەبرسان بۆ ناشتنی پێشمەرگە شەهیدەکە. لەوێ، واتە لە کاتی ناشتن دا، بێستوون بە منی ووت کە سەر ئێشەیەکی توندی هەیە. زۆری نەبرد وەزعی خراپ بوو. بردمانەوە لای ئەو ئوتومبێلەی کە چاودێری دەکردین.

کاتێك مەراسیمی ناشتن تەواو بوو و گەڕاینەوە لای ئوتومبێلەکە، بینیمان بێستون کەوتوە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و وەزعی زۆر خراپە. دکتۆر نەبوو غەیری دکتۆر مەحوود و

دکتۆر شوان. بەڵام بە هۆی نەبوونی هیچ ئامرازێکی فەحس و دەرمانانی پێویست و موختەبەر، ئەوانیش نەیاندەزانی کە وەزع خراپی بێستون لە ئەنجامی ژەهر خواردنە. ئەوە بوو لە دەوری کاتژمێر چواری ئێوارە بێستون وەفاتی کرد. پێش وەفات کردنی ئەو بە نیو کاتژمێر کچەکەی مەلا محرەم هەمان ئەعرازی بێستونی لێوە دەرکەوت. زۆری نەبرد خەبەریان هێنا کە دایکی کاك مستەفاس وەزعی خراپە.
ئەمانە هەرسێکیان یەك لە دوای یەك وەفاتیان کرد. بەڵام ئێمە هیچمان لێ دیار نەبوو. پاش وەفات کردنی هەرسێکیان زانیمان مەسەلە ژەهرە.

بۆ ئێوارەیەکی درەنگ کاك مستەفا ئەعرازی لێ پەیدا بوو. من شەو لای دکتۆر مە حود و موفتی مامەوە بۆ ئەوەی بزانم چیمان بەسەر دێ. برادەران زۆر خەریك بوون بزانن ژەهر لە چی کراوە و کێ بەرپرسیارە لەو ژەهر خوارد کردنەی ئێمە.
زانرا کە لە ماستاو بووە ژەهرەکە. بەڵام تا ژنەکەی جەبار وون نەبوو بۆ شەو درەنگ کەس نەیزانی کە ئەو ئەو تاوانەی کردە.
من و کاك عەدنان بۆ سبەی ئێوارە ئەعرازمان لێ پەیدا بوو. ئو کاتە یەکێتی کاك مستەفایان بەرەو ئێران ڕەوانە کردبوو. ئێمەش دوای بێنە و بردەیەکی زۆر ڕەوانەی ئێرانیان کردین. ئەوەی لەم بەینەدا یارمەتی داین کاك ملازم عومەر عبداللە بوو. دیار بوو کاك عومەر سەرپەرشتی پەیوەندیەکانی جاشەکانی ناوچەی قەڵادزە و ڕانیەی دەکرد بە نهێنی.

بەڕێز سامی شۆڕش پێش نەخۆشی و دوای نەخۆشی

واتە ئەو جاشانەی پەیوەندییان بە شۆڕشەوە هەبوو لە ژێرەوە.
بۆیە کاغەزی بۆ امر سریەیەکی جاش نووسی کە بێت و بمانگەیەنێتە سنووری ئێران.
امر سریەکە هاتە گوندێکی نزیک ناوی قەڵادزە و لەوێوە بە ئوتومبیلێکی جاشان بردنی بۆ ناو مجمعی ژاردەوە و قەڵادزە و لەوێوە بۆ ڕەبیەکەی خۆی. ڕۆژێك من و عەدنان لەو ڕەبیەدا ماینەوە. ئەوەی خیمایەی دەکردین کۆمەڵە جاشێکی (باش) بوون. دواتر هەر ئەو جاشانە تەسلیمی پێشمەرگەیان کردین لەسەر سنوری ئێران. لەوێوە چوینە (ئالۆدتان) و سەردەشت و ئینجا تاران. لە تارانیشەوە بەرەو ئینگلتەرا براین لە ڕێگای ئەمنستی ئینتەرناشنالەوە.

بە ڕاستی من یەك لە باری خۆم زۆر لەوە ورد نەبوومەتەوە کە چۆن ئەو عەمەلیەتەی ژەهرە ئەنجام دراو کێ بەرپرسیارە لەوەی ئێمە تووشی ئەو تاوانە بووین. هەر ئەوەم بە لاوە گرنگ بوو کە بزانم دەستی کێی لە پشتە.

دیار بوو تەحقیقات ڕوو دەربخست کە حکومەتی عێراق بە تایبەتی دەزگای ئەمنی کەرکوك و سلێمانی ئەو تاوانەیان لە ڕێگای ژنەکەی جەبارەوە ئەنجام داوە.
دیار بوو ژنەکەی جەبار پێی ووترابوو کە بە نیسبەتی کەم کەم ژەهرەکە (سالیۆم) بخاتە خواردنی پێشمەرگەوە. پێشتریش چەند جورعەیەکی کەمی دابو بە مستەفا چاوڕەش. بەڵام کە بینی ئەو ڕۆژە خەڵکێکی زۆر کۆبونەتەوە، یان ڕەنگە لە دەستی

دەرچووبێ کە جورعەکە بە کەمیەتێکی زۆر بخرێتە خواردنەوە کارێکی وای کرد کە بە یەك دەفعە خەڵکەکە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە!

بە هەرحاڵ، کە من و مستەفا و عەدنان گەیشتینە لەندەن ڕۆژی ١٩٨٧/١٢/٢٠ وەزعمان زۆر خراپ بوو. بەڵام ئەمنستی دوکتۆرێکی پسپۆریان ئامادە کردبوو. لە خەستەخانەی (لەندەن بریدج هۆسپیتەل) نواندیانین و ئەو دوکتۆرە کە ناوی (دوکتۆر هنری) بوو کەوتە عیلاج کردنمان و دوای نزیکەی مانگێك عیلاج توانی لە خەتەری مردن ڕزگارمان بکات. [٧]

[٧]) کاك سامی شۆڕش ماوەیەك سەرپەرشتکاری ڕۆژنامەی نیومانگی کوردستانی نوێ بوو - چاپی دەولی - لەندەن. ئێستە لە دەوڵەتی چیك عەقدی کاری هەیە بۆ ماوەی ساڵێك لەو نیستگەی ڕادیۆیە کار دەکات کە حکومەتی ئەمریکی بۆ ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی دامەزراندوە و دەنگ و باس و لێکۆڵینەوەکان بە زمانی عەرەبی پەخش دەکات. دوای چەند وتووێژێکی تەلەفونی کاك سامی باسی گێرانەوەی بەسەرهاتەکەی بە ڕێگای فاکس بۆ ناردم لە چیکەوە بۆ ئەڵمانیا.

(٨)

## کاك زاهیر مه حمود، گێڕانەوەی مێژوویەك و بەسەرهاتێکی دورونزیك. لە نێوان ئازار و هاوکاری دا

ئەو کاتەی کە ڕوداوەکەی کاك مستەفاو برادەران ڕویدا من لە هۆلەندە بووم. ناچار بووم کە یەکسەر بکەومە ڕێ بەرەو تاران کە لەوێ هەرچۆنێك بێت بە لایەنی کەمەوە کاك مستەفا دەرباز بکەم بەرەو هەندەران بۆ چارەسەری پزیشکی. من فریای هیچ نەکەوتم کە لە هۆلەندەوە لەگەڵ خۆم بیبەمەوە بۆ ئەوێ. دوای گەڕانەوەم بۆ تاران لە ئەوروپاوە پەیوەندی کرا بۆ کۆکردنەوەی کۆمەڵێك دەرمان،چونکە ئەو جۆرە دەرمانانە لەوێ نەبوون. بە تایبەت بە ڕێگای مارتای خێزانم دەرمانەکان سازکران و بۆمان زوو نێردران بۆ تاران.

ئەو دەرمانانە بە ڕاستی زۆر کەڵکی گەیاند بە برادەران، چونکە لە بەریتانیا و لە شوێنی تریش هەر هەمان دەرمانیان دابونێ. خەستەخانەکانی ئێران بە ڕاستی جیاوازی زۆر بوو لەگەڵ خەستەخانەکانی سەردەمی شا. نزیکەی هەر قەڵەوێرە و شتی سادەی تێدا بوو وە تەنیا شتی سادە بەکار دەهێنران لەوێ.

ئەگەر ئەو دەرمانانە نەبونایە بە پلەی یەکەم کاك مستەفا لەسەر ژیان نەدەما،و زۆر لەوانەیشە کە برادەرانی کەش توشی مەترسی ژیان ببونایە. کچێك کە ناوی (هانیا موفتی) بوو کە ئەسڵی وا بزانم ئوردونی بوو هەستا بۆ هاوکاری کردن بەم کارە. لای ئەمنستی ئینتەرناشنال لە بەشی کاروباری ڕۆژهەلاتی

ناوەڕاستدا لە لەندەن کاری دەکرد. کاک عدنان موفتیش خۆی خەڵکی دەناسی و ئەو کاتەش کاک د. بەرهەم لە لەندەن بوو.

دوای گەڕانەوەم من فیزەی لەندەنم پەیدا کردبوو بۆ مەبەستی سەفەرەکەی کاک مستەفا و هەوڵیشم دا کە فیزەی ئەڵمانیا پەیدا بکەم. پێشتر چەند ئەڵمانێك لە کوردستان لە لایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە گیران،کە ئەو کاتە لای کاک مستەفا خۆی دەستبەسەر بوون. بۆ بەردانەکانیان یەکێتی لەگەڵ حکومەتی ئەڵمانیا ڕێك کەوتبوون لەسەر چەند شتێك یەکێك لەوانە ئەوە بوو کە هەندێك لە بریندارەکانمان بتوانرێن لە ئەڵمانیا چارەسەری پزیشکی بکرێن.

ماجدیش دوای برینەوەی هەردوو قاچی بە ڕوداوی ئەو لوغمەی کە لەسەر قەبران بۆ کاك مستەفایان دانابوو ،بەڵام ماجدی بەرکەوت هاتە ئەڵمانیا بۆ چارەسەری پزیشکی.

لەگەڵ ئەوەشدا دوایی کاك مستەفاش چوە بەریتانیا بۆ چارەسەر. دوای گرتنی ئەشیعەی کاك مستەفا د. هێنری لەوێ بە مارتای خێزانمی وتبوو کە هیوای ژیان بۆ مستەفا نەماوە، چونکە سیەکانی توشی سەرەتان و زیانێکی زۆر بوون. هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ ئێمە بە تایبەت کە بتوانیت بگەیتە بەریتانیا و لێرەش هەواڵی وات بدەنێ. لە تاران غازیان دابویە بۆ پاککردنەوەی ئەو زەهرانە، بەڵام بۆریەکانی ئەو غازانە ئەوەندە ژەنگیان هێنابوو کە سیەکانی توشی پەڵە کردبوو.

د. هێنری پێی ووتم کە لە ٩٩٪ سیەکانی توشی سەرەتان بوون و هیوای لە ١٪ دەهێڵمەوە کە وا بەم جۆرە نەبێت.

ئێمە بۆ دڵنیابی خۆمان پێمان لەسەر ئەوە داگرت کە پارچەیەك لە ئۆرگانی سیەکەی وەربگرن و فەحسی بکەن کە ئایا ئەم بۆچونە چەندە تەواوە. دوای نەشتەرگەری، دوکتۆر بینی کە شتەکە وا نەبوو وە بەوە زۆریش نارەحەت بوو، چونکە لە وولاتێکی وەك بەریتانیا،و لە لەندەن دوکتۆرێك دڵنیا بێت لە قسەکەی و دوایش وا نەبێت زۆر ناخۆشە. ئیتر جۆری چارەسەرەکەیان کە زیاتر لە ساڵێکی خایاند ئەوە خۆت ئاگاداریت لێی.

ئینجا تۆ لێرەدا پرسیاری بەسەرهاتی بنەماڵەی ئێمە دەکەیت کە بۆت باس بکەم. ئەوەندە کێشەو ناخۆشی و گیروگرفت و مەئسات بەسەر خێزانی ئێمەدا رووی داوە کە بە چەند کتێبێکیش تەواو نابێت.

لە ساڵەکانی شەستەوە خێزانی ئێمە لە ریزی خەبات و قوربانی دایە. دوای ئەم هەموو قوربانی و کۆششە بڕوانە چیمان لێ بەسەر هات و ئەم پەرش و بڵاوی و مەئساتانەی کە روی بنەماڵەی ئێمە بوەوە. دیارە کە سەرکەوتنیش بێ کۆشش و قوربانی نابێت. هەروەك خۆیشت ئاگاداریت بەس بڕوانە مەسەلەی گێزاو،و مەسەلەی ماجد. بڕوانە ئەم مەئساتە لە ناو کۆمەڵگای ئێمە کە لەناو گۆڕی دایکت دا قومبەلە بچێنن.
ماجد کە لە ساڵی ١٩٨٤ گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کارەکەی و بە سوتاندنی دایکی و بەو مەئساتە گەورەیە،کە بە داخەوە

هەر بەکرێ گیراوی کوردیش ئەم کارەی کرد کە لەسەر گۆڕی دایکێك قومبەلە و ئەلغام بچێنێت. لە گەڕانەوەیدا بۆ سەر گۆڕی دایکی بە تەقاندنەوەی ئەو قومبەلەیە هەردوو قاچی پەڕی. ئیتر هەرلەو کاتەی گفتوگۆکانی یەکێتی بوو لەگەڵ ڕژێمی بەغدا. هەر بەو ڕێگایەوە گەیشتە ئەڵمانیا و لەوێ خستیانە ژێر چارەسەری پزیشکیەوە و دوایش هەر لەم وولاتە مایەوە.

لە ساڵەکانی هەشتادا شەهید ئەکرەم کە بە (ئەکرەمی حەپسە) بەناوبانگە ئەمیش ڕژێمی بەعس گرتی و ئیعدامی کرد. کاك ئەکرەم وەك ئەندامێکی بەرزی قیادەی مەرکەزی حیزبی شیۆعی عێراقی لە ئۆپەراسیۆنەکانی بەغدا بەشدار بوو وە چالاك و ئازا بوو. ئێمە ئەو سەردەمانە هەموو لە ڕیزەکانی حیزبی شیۆعی بووین دژی بەعس. ئەکرەم لە نامەکەیدا نوسیبوو کە بە داخەوە من لەسەر شتێك ئیعدام دەکرێم کە بڕوام پێی نیە کە ئەویش مەسەلەی چەلالیەتە. کاك ئەکرەم وەك مرۆڤێکی شیۆعی و چەپڕەوی قیادە مەرکەزی بیری دەکردەوە و خاوەنی هەڵگری بیروباوەڕێك بوو وە بڕوای بەم شۆڕشانە نەبوو... بڕوای بە خەباتی چینایەتی هەبوو کە چینی کرێکارو ڕەنجدەر و چەوساوە لە عێراق دا بتوانێ شۆڕش بکات و دەسەڵات لە عێراق دا لابەرێت و گۆڕانکاری بکات. لە چوارچێوەی ئەوەشدا بتوانرێ کوردستانێکی سەربەخۆی ئۆتۆنۆمی دروست بێت.

نامەی شەوی ئیعد م کردنەکەی لە موسڵەوە کە دەڵێ مردن شتێکی ئاسانە بە لامەوە، وە تەوەقوعی ئەم ڕۆژانەمان هەمیشە کردوە کە بکەوینە ژێر باریەوە،بەڵام حەزم دەکرد کە لە شاخدا بومایەو بە چەکەوە بومایە نەوەك بەم مردنە بێکەڵکەی کە بەم

شێوەیە نەمدەویست بیبینم و بە خەیاڵمدا نەدەهات، بەڵام داخی ئەوەشم ناچێت کە لە پێناو شتێکدا ئیعدامم دەکەن کە ئیمانم پێی نیە ئەویش کە مەسەلەی جەلالیەتە کە من دژیشی بووم.

باش لە یادمە کە لە ١٩٦٨ جەلالیەکان هاتنە سەرمان بۆ ماڵەوە کە کاك مستەفاو شەهید ئەکرەم لە ماڵ بوون و ئەو کاتە کاك نەوشیروان لێپرسراوی ناوشار بوو. ماڵەکەیان بە گوللە وەك بێژن لێکرد بۆمان. دەرگاو دیوارمان نەما کە بە گوللە نەبێژرابێت. ئەوە بوو من برینداربووم و ماجدی برایشم هەر لە هەمان کاتدا بریندار بوو. مستەفاو شەهید ئەکرەم بە مقاوەمە دەرباز بوون و یەك دوو کەس لە ماڵەکە کوژرا. ئیتر ئامر قەبز دەرچوو بۆمان کە بمان گرن.

ئەوەی کە من بۆت باس دەکەم ئەوەیە کە شەهید ئەکرەم بڕوای بە ئەوەی کە پێی دەڵێن شۆڕشی پارتی و جەلالیەت و ئەمانە نەبوو. بۆ شتێك خەباتی دەکرد و گیانی بۆ کردە قوربانی کە قەناعەتی پێی هەبوو وە ئەوەش شتێکی گرنگە بۆ ژیانی مرۆڤ.
لە ١٩٧٥ کە ئیتر ئاشبەتاڵ دەستی پێ کرد و گەڕامەوە بۆ سلێمانی و لەوێ وەزعێکی زۆر ناخۆش بوو وە باردۆخێکی زۆر دیارو ئاشکرام هەبوو کە گیانم بەو بۆمبا فسفۆریە چی لێ بەسەر هاتبوو کە تەنانەت پەرداخێك ئاویشم پێ ڕانەدەگیرا.
کە فاروق وەك لێپرسراوی شار هاتەوە سلێمانی بە شەهیدی ووت کە شۆڕشەکەمان هیچی پێ نەکرا و فەشەلمان هێناو قیادە مەرکەزیش تەسلیم بە بەعس بوە.

بەعس دەتوانێ زاهیر بنێرێتەوە بۆ لەندەن. شەهید زۆری پێ خۆش بوو وە من وەزعم زۆر خراپ بوو. شەهید ووتی ئەگەر بەعس ئەوە بکات کارێکی زۆر باشە و زاهیر پێویستی بەوە هەیە کە بگاتە بەریتانیا.

فاروق ووتی بەعس داوای کردوە لێم کە قیادە مەرکەزی دروست بکەینەوە، بەڵام لەژێر ئیشرافی خۆیاندا. شەهید ئەکرەم کە گوێی لەم قسەیە بوو وتی "ئەگەر حەمە لێرە نەدەبوو (بە منی دەووت حەمە زاهیر) لەماڵەکە دەرم دەکردیت. مانای بەعس بە فاروقی وتبوو یا ئەکرەم بێتەوە و لەگەڵیدا قسە بکەو یا قیادە مەرکەزی بەهێز بکەنەوە هەروەك ئەوەی لیژنە تەنفیزی و تەشریعیەکەی سەر بە ڕژێم. دوایی بە منی ووت دەبوایە دەرت بکردایە. منیش وتم نابێت و نەدەکرا. ئینجا مەبەستم لە جۆری بیرکردنەوەی شەهید ئەکرەم بوو. بەعس ئیهتیمامێکی زۆری بە مەسەلەی قیادە مەرکەزی ئەدا و کە کاك ئەکرەم ئیعدام کرا یەعنی بە ڕاستی زۆر بە دوایدا دەگەڕان و فورسەتیان لێ هێناو چەندین توهمەی تریان خستە پاڵی کە هیچی ڕاست نەبوون.

من ئەو کاتە علی قازیم دەناسی (کوڕەکەی قازی موحەمەد)،کە بە حوکمی ئازادی موستەفا خۆشناو کە لە یەك ماڵدا پێکەوە دەژیاین. من لە هۆڵەنداوە چوومە ئەڵمانیا بۆ شاری بۆن و چوومە لای علی قازی و پێم ووت کە کاك ئەکرەم گیراوە و دەبێت شتێکمان بۆ بکەیت. لەوێ سەردار جافم بینی و پێم ووت کە کاك ئەکرەم گیراوە و دەبێت شتێکمان بۆ بکەیت. ووتی ئەوە زۆر بەسیتە. ئینجا سەردار هەموو شتێکی پێ دەکرا. دوایی بە

علی وتبوو کە ئەم مەسەلەیە لە دەستی مندا نیە. بەعس لە ڕاستیدا حسابێکی گەورەی دەکرد بۆ شەهید ئەکرەم. جا بۆیە زۆر گرنگە کە مەسەلەی شەهید ئەکرم بەو شێوەیە بگێڕدرێتەوە کە ڕووی داوە،نەك بە شتی تری دەستکرد.

۱

# زامدار بوونم بە بۆمبای فسفۆر

من لێرەدا دەگەڕێمەوە سەر پرسیاری دووەمت سەبارەت بە بریندار بوونی من. بریندار بوونی من بە بۆمبای فسفۆر. ئەگەر ئەو کاتە "شۆڕشێك" هەبوبێت هەر ئەوە بوو کە ئێستەش ئەم بنەماڵەیە (بنەماڵەی بارزانی) بە هی خۆی دادەنێت. ئەو کاتە پارتی هەبوو، کە هەموو لایەك لە دەوری کۆ ببۆوە. منیش وەك پێشمەرگەیەك و وەك کورد بەشێکی بچووکی ئەم بزوتنەوەیە بووم کە ئەو کاتە هەبوو. من هەروەك بۆم باس کردیت دوای ئەوەی کە کاك مستەفا لە ساڵی ۱۹۷۳ قیادە مەرکەزی جێهێشت ئیدریس خۆی ناردی بە شوێنیدا و پێی وتبو کە تۆ ئەندامی قیادەی مەرکەزی بویت و مەسئولی فەرعی کوردستان بویت و ئێستە ئەم حیزبەت جێهێشتوە و پارتی نایەڵێت تۆ هەروا دابنیشیت و دەبێت بەشداری ئیش و کار بیت لە ڕیزەکانی پارتیدا.

لەو زروفەشدا کاك مستەفاش نەیدەتوانی بە بێ هیچ زەمانێك لە قیادە مەرکەزی هەروا واز بهێنێت و لە ماڵەوە دابنیشێت. دەبوایە لایەك و حیمایەیەکی هەبوایە. ئیتر ئەو کاتەش هەر ئەو "شۆڕشە" بوو کە هەبوو. ئیتر کاك مستەفا گەڕایەوە سلێمانی لەگەڵ علی عبدالله و ئەو لایەنانە دانیشتبوو.

پارتیش وەك پاریەکانی جارانی کاك مستەفایان تۆزێك دوور خستبوەوە. منیش ئیتر هەروەك ووتم بەس ئەوە هەبوو. منیش لەو تەمەنە لاوێتیەی خۆمدا کە دەوروبەری ۱۵- ۱٦ ساڵ بووم

ب

## ناردنەدەرەوەم بۆ چارەسەر کردنم لە لەندەن

بە کورتی باسی هاتنەکەی خۆمت بۆ بکەم بۆ دەرەوە چۆن بوو وە چی بوو. منیان نەناردە دەرەوە وەك کوردێك یان لەبەر خاتری ئەوەی کە پێشمەرگەیەك بوبم. ئەوان شتی وایان نەدەکرد بمنێرن بۆ بەریتانیا. ئەگەر بارزانی بویتایە شتێکی کەیان بۆ ئەکردیت. هەندێك لە خەڵکانی بە تایبەت ڕۆژنامە نوسی بەریتانی کە سەرقاڵی کێشەی کورد و عێراق بوون بەم مەسەلەیەیان زانیبو وە داوایان کردبوو کە دەبێت بهێنرێمە بەریتانیا بۆ چارەسەر، بۆ ئەو سەردەمە شتێکی زۆر بوو کە سۆڤیەت چەکی فسفۆری قەدەغە کراوی بەم شێوەیە داوە بە عێراق و ئەویش بەکاری هێناوە.

مەسەلەکە بۆ ئەوە بوو کە من بهێننە دەرەوە و نیشانی ڕای گشتی و دنیای دەرەوەم بدەن کە ئەمە یەکێکە لە گەورەترین جەریمەکانی سۆڤیەت و شیۆعیەت کە نوێنەری موعەسکەری ئیشتراکیەتە. مەسەلەی پارتی و بنەماڵەی بارزانی لە مەسەلەکەدا نەبوون. ئەمان هەر تەنیا دەیانتوانی فەرمانەکانی شای ئێران جێبەجێ بکەن. من مانگ و نیوێك لە تاران مامەوە و ڕژێمی شای ئێرانیش حەزی نەدەکرد کە من بنێردرێمە دەرەوە بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد گەورە نەبێت. بەڵام داواکە لە دەرەوە کرابوو بە ڕێگای خاچی سورەوە ڕێکخرابوو کە داوایان لە خاچی سوری ئێرانی دەکرد بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە، و ئەمانەیش هەر دوایان دەخست و ڕۆیشتنەکەم بەم هۆیەوە زۆر دوا کەوت.

ئەوەی کە لەو ماوەیە زۆر هاتن بۆ لام عبدالموهیمەن بوو لەگەڵ سابیری کوڕی مەلا مستەفا کە ئەویشیان کوشت. ئەم دوانە بەرپرسیار بوون لە مەسەلە ئیعلامیەکەی من و لەبەر ئەم هۆیە هەفتەی چەند جارێك ئەهاتن بۆ لام. دەمەوێت ئەوەش بڵێم کە بنەماڵەی بارزانی ئەگەر شتێکیشی کردبێت لەسەرێکی ترەوە لەبەر خاتری من نەبوو وەك پێشمەرگەیەك، بەڵکو لەبەر مستەفای برام بوو وە پێویستییان پێی بوو.

ڕۆژانە هەندێ لە بەشەکانی ڕاگەیاندن دەهاتنە لام و دەربارەی ئەم برینداریەی من بە فسفۆر دەیان نوسی دژ بە موعەسکەری ئیشتراکی. بە قەناعەتی من و بەو شێوەیەی کە من سەرنجم ئەدایە وڵاتە ئەوروپیە ڕۆژئاواییەکان بەم کارە هەڵدەستان، وە دڵنیابە لەوەی کە سی ئای ئەی لە پشت هەموو کارەکانەوە بوە...ئیتر دوای ئاشبەتاڵ کەس لەوانە نەهاتن بۆ لام و بێ کەس و تەنیا مامەوە و تەنانەت تەلەفونەکشم لێ لابرا و ئەو پاسەوانەش کە لە بەر دەرگاکەم دەوەستا کە بۆیان دانابووم نەوەك ڕژێمی عێراقی شتێکم لێ بکات.

هەوڵم دا بە ڕێگای (شێرکۆ...) وە پەیوەندی بکەم بە بنەماڵەی بارزانیەوە، بەڵام بێ ئەنجام بوو. ڕۆژێك لە خەستەخانە هاتن بە شوێنمدا و بردمیان. وام زانی کە دەمبەن بۆ خەستەخانەیەکی تر، کەچی بردمیان بۆ فڕۆکەخانەو کاتێکم زانی لە فڕۆکەدام و بەرەوتاران دەفڕم. دوبارە کوێرەوەریەکی تری ژیان دەستی پێ کردەوە. بینیم کە شۆڕش ڕوخاوە و خەڵکی وەزعی تێك چوە و پارە دزین و فەرتەنەیە. من کە ئەمەم بینی وەزعی خۆم هەر لە

بیرچۆوە. کاك مستەفای برام هات بۆ لام بۆ تاران و ڕۆیشتینەوە بۆ سلێمانی. دوایی لەبەر خراپی باروودۆخم گەڕامەوە بۆ تاران و چارەنوس وای هێنا کە لەگەڵ مستەفای برام بتوانین بێینە هۆڵەندە. هەندێ لە وڵاتە ئەوروپییەکان لە دوای ئاشبەتاڵەکە کۆمەڵێك کوردیان گرتە خۆیان کە ئێمە لەو کۆمەڵە کەسە بوین.

وا ڕێکخرا کە دوبارە بچمەوە بۆ هەمان خەستەخانە لە بەریتانیا بۆ چارەسەر. دەبێت ئەوەش بڵێم کە مەسعود لەگەڵ جەوهەر نامیق و سامی م. عبدالرحمن دوو جار هاتن بۆ لام. مەسعود پێی وتم چیت دەوێت ماڵی بارزانی بۆتی دەکەن.

(٩)

## بەڕێز خدیجە حسێن ئەمین، بیرەوەریەکی تاڵ و پڕشانازی بۆ دایکانی نیشتمان
## - لە بیرەوەری دایکێکی مەزن -

خۆشەویستی یەکێکە لەو سەرەتا گرنگانەی کە پەیوەندی مرۆڤایەتی پێکەوە دەبەستێت، و ئەگەر مرۆڤ،و بە گشتی هەموو گیانلەبەرێك ئەم بوونە گرنگەی نەبوایە ئەوا ژیانیش نەدەبوو.

دایك و باوك ئەوکاتە گوێیان نە ئەدایە منداڵی خۆیان و بە گیان و ژیانی خۆیان نەیاندەپاراست و بە خۆشەویستیی گەورەیان نەدەکرد. ئەمە دیاردەیەکە کە هەر لە سەرەتاوە بوونی دراوەتێ. بەڵێ، بەڵام خۆشەویستی خاك و وولاتیش هەیە،خۆشەویستی ئەو شارو گوندو شوێنە هەیە کە مرۆڤی پێوە بەستراوە و بیرەوەری تێدا دروست بوە و زمان و کولتوری تێدا فێر بوە و مرۆڤەکە چاوی تێدا کردۆتەوە و لە دڵ و ناخیدا پێوەی لکاوە و بەو زمانە خەون دەبینێ و دۆست و دوژمن لەیەك جودا دەکاتەوە.

بە تایبەت دایك خۆشەویستە، چونکە خۆشەویستی دایك بێ سنورە بۆ منداڵی خۆی. هەرچەندێك پاداشتی بدرێتەوە کەمە. دایك نەك هەر ناخۆشی کاتی دوگیانی دەبینێ، بەڵکو شەونخونی دەکێشێ و منداڵی گەورە دەکات و فرمێسکی بۆ دەرێژێ و لە دڵ و ناخیدا هەست بە ئازار و ناخۆشیەکەی دەکات و بە ترپەی دڵ و بە گورانی لایەلایە دەیخەوێنێ و حەز دەکات مەرگی پێش مەرگی کوربەکانی بێت و مردنیان هەرگیز بە چاوی خۆی نەبینێت. هەربۆیە ڕێز و مافی دایکایەتی زۆر گرنگ و پیرۆزە.

ئەم هەست و وشانەم لە دایکی خۆمەوە بینی و نەمتوانی پاداشتی شەونخونی بدەمەوە. هەروەك ئاماژەم بۆ کرد ئەو ئاوات و خەوەمان کە هی هەموو خێزانەکە بوو، لە دوای چەندین ساڵێ ژیانی دورە وولات بە یەکتر شاد بینەوە بۆ هەمیشە چوە ژێر گڵ.

پێش گەڕانەوەم بۆ خوارووی کوردستان و سەردانی چەندین گۆڕی خۆشەویستان، پێش سەردانی گۆری دایکێکی شەهیدی نەتەوەکەمان و هی نیشتمان خوشکە خەدیجە حسێن، دەبوایە بە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دا، بە شاری مەهابات دا، بە شاری چوار چرادا تێپەڕ بم و سەردانی دایکێکی تری خۆشەویست و مەزن و لە یاد نەچوو بکەم کە ئەویش دایکی خۆمە. هەر بۆیە ماوەیەکی زۆر پێش گەڕانەوەم هەوری غەم و پەژارە زیاتر باڵی کێشابوو بە سەرمدا و لە نا خەدا ئارام نەبووم.

لە بینینی دایکێکەوە بۆ دایکێکی تر، لە کوردستانەوە بۆ کوردستان کە تەنیا سنورێکی دەستکرد لە یەکتریان جیا دەکاتەوە. ئەو هەست و تاقیکردنەوەیە پێم دەڵێ دایك خۆشەویستە و هەموو دایکی کورد دایکی منیشە، دایکی شەونخونی فرمێسك و بێ ماف. کۆرپەکەی بەو ئازار و ناخۆشیە لە دایك دەکات و گەورە دەکات، کەچی زۆر جار بە گوللەیەکی بێ نرخ، بە ژەهری دەستی نەفرەت لێکراوێك گیان ئەدات بە دەستەوە و ماڵ ئاوایی هەمیشەیی دەکات.
لەبەر ئەو تێکەیشتنەیە کە ووشەکان لە دڵ و دەرون و ناخ و هەستمەوە هەڵدەقوڵێن و دەزانم چی دەنوسم و بۆ کێی دەنوسم. [٨]

---

[٨]) باوکم تەمەنی تۆ ساڵان بوە کە لەگەڵ باپیرم و نەنکم بۆ دابین کردنی سەرچاوەی ژیانیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بەرەو خوارووی کوردستان گوند بە گوند هاتون. هەتا لە شاری سلێمانی نیشتەجێ بوون و بە کار و زە حمەتی نانی ڕۆژانەیان بۆ ژیان دابین کردوە. هەر بە هەمان شێوە کەس و کاری دایکیشم. هەردولایان خەڵکی گوندێك بوون و لە منداڵیەوە یەکتریان ناسیوە. لە عێراق هیچ کام لە ڕژێمەکان ئامادەی ئەوە نەبوون کە جنسیەی عێراقیمان

بدەنێ، و لە وولاتی باوباپیری خۆماندا دەبوایە وەك بێگانە و بە مەرجەکانی هاوولاتی بێگانە و بێ ماف بژین. دوای دەیان ساڵی بێ ماف بوون و شەڕی دەروونی و لە ژیان لە ترس و بێ هیوایی لە کۆتاییدا لە وولاتی خۆمان لە لایەن ڕژێمی بەغداوە بە دەستبەسەری دەرکراین و ماڵ و موڵکمان داگیرکراو ناچاری کۆچ کردن کراین، و ئەمڕۆکە چارەنووس بەسەر چەندین وولاتانی ئەوروپادا دابەشی کردوین و نیشتەجێ بوین و دەژین.

هەتا ئەو کاتەی کە ڕژێمی سەدام حسێن لەبەر ئەو هۆیەو و لەبەر چالاکیی دیاری ئێمە (ئەو کاتە بەشێکی خێزانەکە) لە هەندەران دژ بە ڕژێم لە نیشتیمانی دێرینی خۆمان دەریان کردین بۆ ئێران و لەوێ سەرەتا بوونە پەنابەندە و چوونە لاگەری جەهروم. من ئەو کاتە لە ئەوروپا بووم. لەوێ پێیان دەووتن عێراقیەکان و لە عێراقیش پێیان دەوتین ئێرانیەکان. من لەم گەڕانەوەی ئەمجارەمدا (٨-١٩٩٩/١٢) بۆ یەکەم جار بوو کە ئێران ببینم. دایکم بە ڕوداوێکی دل تەزێن لە مانگی ١٩٨٨/٨ گیانی پاکی هەر لەوێ بە خاکی کوردستان بەخشی و لە گۆڕستانێکی شاری مەهاباد بە خاك سپێردرا. من هەتا ئەم دواییەش لەبەر فاکتەری خۆی بە هیچ شێوەیەك زاتی ئەوەم نەدەکرد کە بچمە ئێران.

هەر بۆیە بڕیارم دا کە لە گەڕانەوەمدا بۆ ئەوروپا ماوەیەك لە کوردستانی ئێران بمێنمەوە و بە دوای ئەو ئەسل و دێهات و بیرەوەریانەدا بگەڕێم و وێنەیان بگرم و تۆماریان بکەم. وە تەنیا پیرترینی کەسی خێزانەکەمان کە لەسەر ژیان ماوە و بتوانێت بەشێکی ئەو بەسەر هاتانەم بۆ باس بکات کە بریتیە لە مێژوویەکی سیاسی و کۆمەلایەتیش لە هەمان کاتدا بریتیە لە باوکم. دەشڵێن کە چەند کەسانێکی خزمی بە تەمەن ماون لەو دێهاتانەدا. بە هیوای ئەوەی کە لە دواڕۆژدا بیان نووسمەوە لە کتێبێکدا لەگەل بیرەوەریەکانی ئەوروپام کە زیاتر لە نیوەی تەمەنم تێیدا بردۆتە سەر، و جگە لەوەی کە گرنگی بۆ خۆم و کەس و کارم و نەوەکانی بنەماڵەی خۆم و دوای خۆم هەیە، پێشکەشیشی دەکەم بە خوێنەر بۆ تێگەیشتن لە واقع و ترازیدیایەکی تری ئەم ژیانە پڕ سەر ئێشەیە. لە گەڕانەوەی داهاتومدا بەم ئەرك و پێویستیە دەهەوێت هەستم چونکە دۆزینەوەی ڕەگەزی بنەماڵەی ئێمە بریتیە لە مێژووی سیاسی نەتەوە و نیشتمانەکەشم.

دایکێکی نەخوێندەوار کە ئامادەبێت هەر بەردەوام نزیک بێت لە کورەکەی و خۆشەویستی بداتێ و هەست بە بوونی یەکتر بکەن، دایکێك کە ئامادە بێت دوای ڕێبازی کورەکەی و نەتەوەکەی بکەوێت و ئامادەی قوربانی و شەونخونی و خەم و پەژارە بێت و دوایش بەبەر چاوی منداڵەکەی خۆیەوە، و بە دەستی دایکێکی تری کورد بۆ هەمیشە گیانی فیدا بکات. خۆی کردە قوربانی بۆ ئەوانەش کە دوژمنی نەتەوەی خۆیان بوون و لە خزمەتی بێگانەدا بوون. بۆیە کوشتنی ئەم دایکە لە هەمان چرکەدا شەرمیە بۆ هەموو ئەو جۆرانە کە لەبەر بەرژەوەندیەکی تایبەتی بێ نرخ ببنە دوژمنی سەرسەختی مرۆڤ و کۆمەڵگایەك بە تایبەت ئەگەر خۆیشی ئەندامێکی بێت و سەر بەم بێت.

دایکێکی خۆشەویست و لە خۆ بوردوو لەسەر خاکێکی خۆشەویست و نیشتمانی خۆی ماڵ ئاوایی کرد و ئەو دایکە بیرەوەریەکی تاڵ،بەڵام پڕ شانازیی بۆ هەموو دایکێکی تری وەك خۆی جێ هێشت.

خاتوو خەدیجە حسێن ئەمین وەك یەکێك لە دەیان هەزار نمونەی قوربانیانی تر پێویستە بکرێتە سیمبۆلی دایکانی نیشتمان. دایکێك کە بەرگی هەموو دایکانی تری نیشتمانی پۆشیوە.

لەسەر گۆڕەکەی دایە خەدیجە لە دێی ئاوەژێ شیعرێکی بەرێز شێرکۆ بێکەسی لەسەر تۆمار کراوە کە شاعیری ناوبراو بۆی نوسیوە و پێشکەشی کردوە،و دەڵێت:

"دایکی خەم و ژانی کورد بووی، وەك ڕەز
سوتای چەندین ساڵ بوو بە دوای کوڕی پێشمەرگەتا،
دڵت مەلێکی عەوداڵ بوو.

---

ژنێ بوی چەشنی گەوهەرتۆ، پاکیش وەکوو ئاوی ڕەوان
ساکار وەکوو گوڵی کێوی و ،هێمن وەکوو شنەی شەوان

**بەڕێز مستەفا چاوڕەش لەسەر ئارامگەی**
**شەهید (خەدیجە حسین امین)**

# ڕۆژێکی تەماوی

ڕۆژێکی تەماوی... تەوژمی غەم دەرونی دەکولاند. تیشکی خۆر لە جیاتی ئەوەی زیوینی بنوێنێ سور سور، کانیاوەکان هەر وەك چاوی هەتیوی بێ دایك و باوك زەویان بە فرمێسك دەبڕی. وەرزی خێزان نەبوو، وەرزی خێزان نەبوو کەچی گەڵاکان زەرد هەڵگەڕابوون. ئاسنگەران و ژیلوان و پیرەمەگرون دەتوت پێلوی چاوی ئەو دایکەیە بە شوێن ڕۆڵەکەیدا وێڵ و سەرگەردانە. بروسکەی پڕ لە ژان دۆڵەڕووت و دەشتی مەرگەی ئاساندبوو.

چرۆیەکی تری سەرکەوتن گوڵی گرت. دڵی چەند تێکۆشەرێکی تری مەزن و دایکێکی تری بەوەفای کوردستان لە لێدان بۆ هەتا هەتایە کەوت. لاشەی پیرۆزی جۆشدانی ڕێبازی شۆڕشگێڕانەی چەند هاوڕێ و خوشك و برای تری بزوتنەوەی کوردایەتی چوە ناو خاکی سەدان ساڵەی شۆڕش، سەدان ساڵەی فیداکاری، سەدان ساڵەی بەرگری مان و نەمان. چەند قارەمانێکی تری ئەم نەتەوەیە لە خوێنی خۆی گلا و لە ئاڵای سەربەرزی ئالا.
بە لە خۆ بوردویی و فیداکاری ئەم تێکۆشەرانە ساتێکی تری تەمەنی کورتی شەوەزەنگی ژێر دەستی و چەوسانەوە کەم بۆوە.

دەك هەزاران نەفرەت لەو ڕۆژەی هاوڕێیەکمان، تێکۆشەرێکمان، دایك و خوشکێکی نیشتمانمان لە کیس دەچێ. هەزاران نەفرەت لەو ساتەی پەنجەی ناجوامێرانەی نامەردێك دەچێتە سەر پەلە پیتکەی ڕق و کینەی تفەنگ و دەستی دەچێتە ژەهری ڕق و کینەی ڕەشی بۆگەنی ناحەزان و لاشەی ڕۆڵەیەکی بە وەفای گەل دەبڕێ و بە ناکامی دەیخاتە ژێر گڵ.

لە ١٩٨٧/١١/٢٤ دایکێکی تری بەڕێز خوشکە خەدیجە حسێن ئەمین، دایك و هاوڕێیەکی بە وەفای کوردستان شەهید بوو. گیانی

پیرۆزی گەیشتە کاروانە دێرینە پڕ لە شانازی و کارامایەکەی شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان و ڕێبازی سەرفرازی چەوساوەکانی کورد و بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلانی بن دەست و ستەم دیدە و بەش بەش کراو. گیانی خۆی و کاکە بێستون و خوشکە سریعە... بە خاکی کوردستان سپێردران و بوونە قوربانی و ڕێگای نەهێشتن و کەسبونەوەی ژێر دەستی بۆ ئەوانەش کە دووره پەرێز وەستاون.

گوندی سێروانی ناوچەی مەرگە. گوندی سێروان باوەشی پڕ لە ڕێز و خۆشەویستی خۆی کردەوە بۆ ڕۆڵێەکی دلسۆزی ئەو بنەماڵەیە. جاران بە زەردەخەنە و بزەی سەر لێوەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە هەنسك و فرمێسك، بە هەنسك و فرمێسك گرتیانە باوەشی پەژارە و ڕێزەوە لەگەل ناڵەی دەروونی هاوڕێ پێشمەرگەکانیدا ماڵ ئاوایيان لێ کرد، دوا ماڵ ئاوایی. ماڵ ئاواییان تەنیا لە لاشەکەی کرد و پیرۆزباییان لە گیانی مەزنی کرد کە ڕووی کردە هاوڕێکانی تری.

دایکە خەدیجە و کاکە بێستون و خوشکە سەریعە و ئەوانەی تر ڕوویان کردە کاك ئارام. ڕوویان کردە کاك سیروان و کاك خالید و کاکە گۆران و کاکە شەهابی شێخ نوری و زۆراب و جەمالی عەلی باپیر وعەلی عەسکەری و نەبەز و بگرە هەزارانی تر. ئەم تێکۆشەرانە بە جەستەی ژەهراویەوە ڕوویان کردە ئەوان و سلاوی تەواو کردنی ڕێی ئەوانی لێ کردن.

گەرچی خوشکە خەدیجە و هاوڕێکانی زوو لە دەست شۆڕشی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی چوون، بەڵام بە خەبات بە گیانبازی بە ووره‌ی نەلەقیو، بە ڕاستگۆیی، بە نەفەس درێژی و بە خۆڕاگری، بە تێکۆشان و قارەمانێتی مێژوویەکی پڕ لە شانازی و سەربەرزی نەك هەر بۆ خۆیان و بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەڵکو بۆ گشت دایکانی نیشتمان، بۆ کوردستان تۆمار کرد و بە خوێنی پاکی خۆیان

دێڕەکانیان نوسیەوە. هەموو بن بەرد و شاخ و کێوێکی هەرێمەکە و ناوچەی مەرگە و گەلێك ناوچەی تریش لە کوردستان دا شایەتی پەیوەندی توند و تۆڵی کاك مستەفا و هاوڕێکانیەتی بە مەسەلەی ڕەنجدەر و لێقەوماوانی کوردستانەوە. نەبەردەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرامبەر بە فاشستەکان لەو ناوچانەدا بڕوانامەی بە جەرگی و ئازایەتی ئەم هەڤالانەن.

هەستی بێگەردی جوتیاران و زە حمەتکێشانی ئەو ناوچانە لە کاتی بە خاك سپاردنی خوشکە خەدیجە و کاك بێستون و خوشکە سەریعە و پێشمەرگە شەهیدەکان دا چاکترین نیشانەی ڕاستگۆیەتی ئەو خوشك و برایانەن لە خەباتیاندا لە پێناوی نەتەوەیەکی بێ بەخت دا.

هەروەك وەرزێرە بە ساڵاچوەکەی مەرگە ووتی ئەم جەنگاوەرانە لە دەست ئێمە چوون، هەموویان کوڕ و کچی ئێمە بوون، نەك هەر پێشمەرگەی شۆڕش، پێشمەرگەی ئێمە بوون. دایکێك، خوشکێك چەکدار یان بێ چەك لە گۆڕەپانی شەڕدا، یان بە ژەهر شەهید بوبن، یان بە هەر هۆیەکی تری کۆمەڵایەتی، ئابوری و لە ئەنجامی غەم و پەژارە و باری سەرسەختی زروف ماڵ ئاوایان کردبێت شەهیدن و پێشمەرگەن و جێگای یاداشتن.

لەبەر ئەوەیە دا خەمان ناچێت کە ئەم خۆشەویستانە جێیان هێشتین و غەم و پەژارەیەکی زۆریان بۆ هاوڕێکانی کۆمەڵە و هەموو هەڤاڵانی ی.ن.ك و گشت شۆڕشگێڕەکانی کوردستان و ئازارێکی قورس و تەمەن درێژی بۆ ڕەش و ڕوتەکانی کوردستان جێ هێشت.
بە دڵسۆزی و خۆشەویستی و پاکی و ناسراوی و ئازایەتی ماڵ ئاوایان لە کەس و کار و کورد کرد.

خوشکە خەدیجە هەمیشە زەردەخەنەی میهرەبانی ڕوخساری دەگردەوە. کاتێك ژەهری نەفرەت لێکراوی مەرگ پێکای و کاتێکیش

شەهید دایکە ( خدیجە حسین امین )
بەزەردە خەنەوە بۆ ژیان دەڕوانێ

دڵی لـە لێـدان کـەوت و کـانێکیش خرایـە ژێـر خـاک بـە هـەمان زەردەخەنەوە نیشانی دا کە ئەو ڕۆیشتوو ڕێگەکەی کردە ئەمانەتێك لە دەست هاوڕێکانی تریا، لە دەست دایکان و ئافرەتانی تریا و لە دەست کوڕەکـەیدا هـەروەك سـەدان و هـەزاران لـە دایکـانی نیشـتمان، لـە کاروانی شەهیدان.

خوشکە خەدیجـە جێـی هێشـتین و خوڕەوشـتی بـەرزی بـۆ دایکـان و نەوەکانی بەجێ هێشت کە بیکەنـە مایـەی سـەربەرزییان. بـەڵێ بـە جێـی هێشـتین و بیروبـاوەڕی بـەرز و خۆشەویسـتی زیـاتر لـە نـاو دڵ و دەروونـی ڕەنجـدەران و زە حمەتکێشـانی دایکـان و کـورد بـە گشـتی چەسپاند. هـەروەك کاکە بێستون و کاك جەمالی عەلی بایـیر و کاکـە ئارام و هاوڕێکانی بـە جێی هێشتین و زیاتر خۆشەویستی کۆمـەڵانی خەڵکی کوردستانی بۆ بیروباوەڕەکەی سەلماند.

بـە جێیـان هێشتین و ڕێبازی شۆڕشیان وەك چرا، وەك خوێنی پـاکی خۆیان بۆ چەوساوانی کوردستان ڕۆشن کردەوە، بە جێیان هێشتین و ئاڵای هـەمیشە بەرزی شۆڕشیان زیاتر لە جاران بلند کرد. بە جێیان هێشـتین و جـارێکی تریـش دوپاتیـان کـردەوە کـە شۆڕشـی نوێـی گەلەکەمان باوەشی گەرمی ئاسودەی نەتەوەیەکی ژێر دەستە.
بـە جێیـان هێشتین و بۆ فاشست و چلکاو خۆرانیـان دوبـارە کـردەوە خـەباتی هـەر هـەنگاوێکی مـەزنی شۆڕش خوێنـە، شـەهیدە، بـەرگری شەڕی مان و نەمانە.

کێ دەڵێ خوشکە خەدیجە و سەریعە و کاکە بێستون و کاکە ئارام و گشت هاوڕێکانیان و پێشمەرگەکانی نەتەوەکەمان مردون؟ کێ دەڵێ مردون و لە ناو هاوڕێکانیاندا نەماون، کێ دەڵێ شوێنی دیاریان لە ناو سەنگەرەکانی شەرەف و مەردایەتیدا نەماوە؟ دەبێت ناوی بەرزی هەموو ئەم تێکۆشەرانە بە سەرجەم شەهیدانەوە بەسەر زاری هەموو مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر و خاوەن ویژدانی گەلەکەمانەوە بێت. لە هەموو کۆڕ و کۆبونەوە و یادەوەرییەك ئەم هاوڕێیانە لەگەڵیاندان.

هەموو مرۆڤێکی زامدار و دڵ برینداری و خاوەن غەم و پەژارە دەبێت جێگای ڕێز و هاوکاری بن، چونکە ئێستە زیندوون، بەڵام زۆربەیان زیندوییەکی مردوون و هەموو ڕۆژ و ساتێکیان مردنە و لە ئازاری خۆیان و بیرەوەری کوژراو، و زیندانییەکانیان و هاوڕێی نەتەوەکەیان، لە غەم و پەژارەی شەهیدان و ئەنفال و بە کیمیا ڕۆیشتوەکانیاندان.

تەنانەت دوژمن لە مەرگیشیانا ڕێگای لە خەڵکی شارەکەی هەڵمەت و قوربانی دەگرت کە ڕێی دووری غەم بگرنە بەرو ڕوو بکەنە گۆڕەکانیان یان بۆ پرسەی ماتەمینیان.

ئەم هاوڕێیانە دەیانبینین، دیارن و دەیانبینین بە خۆیان و تفەنگ و بەرگە خاکیەکانیانەوە، بە خۆیان و زەردەخەنە و چاوە پڕ لە ئومێدەکانیانەوە. ئەم تێکۆشەرانە هەر یەکێکیان بۆ هەمووان دەژیا و هەموانیش بۆ یەکێك.
ئەم تێکۆشەرانە بە جێیان هێشتین و ئاڵای هەمیشە بەرزی کوردایەتیان زیاتر لە جاران بڵند کرد، بە جێیان هێشتین وجارێکی تر دوپاتیان کردەوە بۆ فاشست و چلکاوخۆران کە باجی هەر هەنگاوێکی مەزنی کوردایەتی خوێنە، شەهیدە، بەرگری و شەڕی مان و نەمانە.

ڕێگاکەمان دوورودرێژ و سەخت و پڕ هەورازو نشێوە. لە ناو هەر سەنگەرێکماندا چەپکێك گوڵی ڕەنگ جوانی سەربەستی و خۆشەویستی جێ دێڵین. دڵمان پڕ ژان و ئازارە و لەگەڵ هەر ئازارێکدا هاوڕێیەکی شەهیدمان دەلاوێنینەوە. بەرەو خۆری ئازادی مل دەنێین و هەنگاوی تاڵی و سوێری ژیانمان داوە بە شاندا و لەگەڵ هەر ساتێکی تاڵی و برسێتی و تینوێتیدا هاوڕێیەکمان خۆی دەکاتە خەڵاتی دوارۆژی گەرمی ئازادی.

شەوگاری زام دەبڕین و لە هەر جارێکدا هاوڕێیەکمان دەبێتە چرا و هەنگاوەکانی ئایندە بۆ هاوڕێکانی ڕۆشن دەکاتەوە. هاوڕێیانی شۆڕش شەیداو عاشقی سەربەستین، شەیدای سەرفرازین، بۆیە خۆیان دەکەن بە ئاگر، ئاگری دوژمن سوتێن و ئاگری کورەی تێکۆشان و گرتنە ئەستۆی باری گرانی گەیشتن بە ژیانی بێ چەوساندنەوە و ئازاردان، گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی یەکسان و دادپەروەر...
بۆیە هەر لادانێك لەو ڕێبازەی کە تێکۆشەران و شەهیدانی کوردستان بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزانە بونەتە قوربانی لادانە لە ڕێبازی کوردایەتی، لە شۆڕشی ڕزگار بوون،لە کۆیلایەتی و تا یەکسانی و دادپەروەری.

بەشێك لە مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە ئەمڕۆکە لەسەر حسابی ڕەشو ڕوتو بێ دەسەڵاتەکان ژیانی خۆشیی خۆیان پێکهێناوە و ڕۆژانی ڕابوردویان لە یاد بردوە و لە خۆ گۆڕاون.

بەڵێ بەو هیوایە دەژیم کە لاپەڕەکانی ژیانی چۆنایەتی ڕابووردوی ئەو کوردایەتیە پڕ جۆش و خۆشەویستیە بژی، بژی بۆ ئەوانەش کە لە پێناویدا تێکۆشان و مردن، و ژیان و خوێن و سەروماڵیان لە پێناویدا دانا و زۆریشیان ئەمڕۆکە هیوا زیاتر بە مردن دەخوازن وەك لە ژیانی بێ باداشتی سەردەم... بەڵێ بۆ کۆمەڵگایەکی یەکسان و بە وەفا و دادپەروەر و براوبوون بە یەك.

کۆمەڵێك لە دیاردە و ڕەفتاری ناشۆڕشگێڕانە و کۆمەڵگا کوشندەی کە من ئەمڕۆکە دوای چەندین ساڵی شۆڕشی کوردایەتی و هەڵگری مەشخەڵی ئازادی دەیبینم، توشی ڕشتنی فرمێسکی غەم و پەژارەی کردووم، و ئەگەر ئەو شەهیدانەی لە پێناویدا گیانیان لە دەست داوە ببینن لەوانەیە لە گۆڕەکەیاندا بجولێن و بێنە زمان و دادگایی کردن داوا بکەن...

بە واتا ئەوەی کە من ئامازەی بۆ دەکەم بریتیە ئەمڕۆکە لە دوو دیو کە دیوی ئەنفال و شەهیدان و ڕەش وڕوت و ڕەنجدەر و بێ ماف، و دیوەکەی تری دژ بە لادان لە پرەنسیپە دیموکراتیەکان و جێهێشتنی مەبادیئەکانی شۆڕش لە نیوەیدا و گیرفان پڕکردن و خۆشگوزەرانی لەسەر حسابی ژیان و تێکۆشان و مافی مرۆڤ، بۆ نەهێشتنی دیوە خراپ و چەوتەکەی تری کە من بە پڕۆسەیەکی ناکۆمەلایەتی و کوشندەی دەبینم و دەترسم لەو ڕۆژە ڕەشانەی کە چاککردنەوەی ئیتر گران بێت.

مرۆڤە خەباتگێڕەکە لە سەر مردنە، بە توندی سەیری مرۆڤەکان دەکات و دەڵێ " من ئەوەندەم خۆش دەوێن... "، بەڵام دەمرێتەوە. بیست، سەد، دە هەزار، چەندین ملیۆن مرۆڤی تر بانگ دەکرێتە ئەوێ. هەمیشە و لە گشت شوێن مرۆڤەکانی تر دێن دەوری مردوەکە دەگرن، سەیری دەکەن و قسەی لەگەڵ دەکەن. لە کۆتاییدا هەموو مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەمینی کوردستان دەوری مردوەکە دەگرن. لاشەکە لەسەر خۆ هەڵدەستێ و باوەش بە یەکەم مرۆڤەکان دەکا و دەکەوێتە جوڵە. بە تەنیا هاوکاری هەموو نەتەوەی کورد و خەباتگێڕانی بە گیان و ڕۆحی بەوەفایی و فیداکاری و پاکی و

عەدالەتەوە دەتوانێ مردوەکانمان زیندوو بکاتەوە. وە ئەگەر ئەو مردوانەش هەستن ئەو کاتە شۆڕش دەبێت.

لە ژێر هەندێ باروڕدۆخی گونجاودا کەسێك یان کەسانێکی تایبەت دەردەکەون و زیاتر پێشڕەوی بزوتنەوەکە دەگرنە دەست و لە پەیوەندی کێشەکان دەگەن و دەڕوانن لێی و لە جێگا و پێویستی خۆیدا شی دەکەنەوە.

من لە ئەوروپا بۆ ئەوروپی دەنوسم وە بە زمانی کوردی بۆ کوردەکانی دوورە نیشتمان دەنوسم، وە هەر لێرەشەوە، لە ئەوروپاوە بۆ هاووڵاتیانی کوردستان دەنوسم، وە بۆ ئەوانەی کوردستان و ئەوانەی مرۆڤەکانی جیهانی سێیەم کە دەستیان دەگاتە کتێب و خوێندنەوە. لەبەر ئەوە کەم ئیحتیماڵە کە پارتیزانەکانی باکوری کوردستان، و ئەوانەی دارستانەکانی گواتیمالا، وە خەباتگێڕەکانی شاخەکانی ئەریتریا، شۆڕشگێڕە بەدەویەکان لە ڕۆژئاوای سەحرا و جوتیار و کرێکار و ڕەنجدەرانی نەخوێنەواری کوردستان و زۆری تریش بتوانن کتێبەکەم بخوێننەوە.

(١٠)

## بەڕێز ئەهاوەند خانم، لە نێوان بەندیخانەی فاشستەکان و ئازاری تراژیدیاکەی ناوچەی مەرگە

دوای گرتنەکەمان لە سلێمانی ئێمەیان برد بۆ(سجن امن العامە) ی بەغدا کە گوایە بەرمان ئەدەن و بۆ ئەم مەبەستە ئیشمان بۆ دەکەن. لەوێ پاش هێنان و بردنێکی زۆر تێگەیشتم کە ئەمانە ئەم موئامەرەیەیان بە دەستەوە بوو. لەوێش شەڕی دەرونییان لەگەڵ دەکردین بەوەی کە دەیان ووت بەردەبن و تەنیا ئەوەندە ڕۆژی ترە و پەیمانی درۆیان ئەدا کە بەردەبین.
دیار بوو کە موئامەرەکەیان دانابوو. ناردیان بە شوێنماندا و چەند قسەیەکی ناشیرینیان بەرامبەرمان کرد، و بردمانیانە ژورەوە دایانناین. دوایی بانگیان کردینە ناو دائیرەکەیان و وتیان ئازاد بەردەبن.

بەڵام هاتوچۆو جموجوڵەکانیان دیاربوو کە کارێکیان ئەنجام دابوو. ئیتر ئەم مەوزوعی ڕوداوی زەهر خوارد کردنە سێ مانگ بەسەر گرتنەکەی ئێمە تێپەڕی کردبوو، و هەر لە بەندیخانە ئاگاداری ئەم مەوزوعە بووم. کەوتینە دەوروبەری مانگی دوانزە، پێنج خێزانیان هێنابوو بۆ لای ئێمە. ئەم پێنج خێزانە کوڕەکانیان لە سلێمانی لە دوڕیانەکەی سەرچنار ڕەمییان کردبوون و لە ڕێکخستنی ناو شار بوون. ڕژێم خێزانەکانیانی بە دایك و باوك و خوشك و براوە هەموو گرتبوو.

ڕۆژێکیان کە ڕێکەوتی ڕۆژی پێنج شەمە بوو دایکان و خوشکانیان هێنا بۆ لای ئێمە بۆ دائیرەی امن العامە. ئەو کاتە

هەمووی عەرەبی تیا بوو ،و بەس من کورد بووم لەوێ. کە لە ڕۆژی پێنج شەمە هێنایانن بۆ لامان، ڕۆژی هەینی لەوێ مانەوە و ڕۆژی شەمە بەیانیەکەی زۆر زوو بردنیانن. ئیتر زۆر بە داخەوە کە ئەم پێنج خێزانە هەتا ئێستە دیار نین و بێ سەروشوێنن. بە دڵنیاییەوە لەسەر ژیان نەماون.

پرسیار: ئەم ڕوداوی زەهر خواردنەت چۆن بیست؟
وەڵام: دوای ئەوەی کە زانییان من خێزانی مستەفام و زریانیان بینی بەم ڕوداوەیان دەزانی لە سلێمانیەوە. ئیتر بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕامەوە و وتیان لەماڵی ئێوە و لە مقەڕی ئێوە ڕووی داوە و چەند کەسێکی تێدا شەهید بوە. ئیتر من زۆر خەمم بوو، و بە هیچ شێوەیەك دڵم ئارام نەدەبوەوە، وتم دیارە هیچیان نەماوون هەرچەندە سوێندیان خوارد بە گۆڕی شەهیدەکانیان کە کاك مستەفا لەم ڕوداوەدا شەهید نەبوە و ماوە. ئەو کاتە من براکانیشم لەگەڵمدا پێشمەرگە بوون، و دڵنیایان کردم کە براکانم هیچیان لێ نەهاتوە،بەلام ئەوەی کە شەهید بوە دایە خەجێ بوە و سەریعەی مەلا محرم و کاك بێستونی مەلا عومەر بە ڕەحمەت بن. ئەمانەیان هەموو پێ وتم. بەڵام ئیتر من بە هیچ شێوەیەك بڕوام نەدەکرد، وتم دیارە ئەوانەی تریش هەر لە خەتەردان. ئیتر هەتا ئەو ماوەیە کە ساڵێکی تری بەسەردا ڕۆیشت هەتا ئازاد بونمان من هەر زۆر دڵم لە مەراقدا بوو بۆیان. [1]

---

[1]) وەك لە گێڕانەوەکەدا ڕوون بۆتەوە تەهاوەند خانم خێزانی کاك مستەفا چاو ڕەشە. ئەم وتووێژەم لەگەڵیدا لەسەر گۆڕەکەی دایە خەجێ لە گۆڕستانەکەی دێی ئاوەزێ لە ناوچەی مەرگە کردوە کە لەگەڵ کاك مستەفاو ماڵ و منداڵ سەدانیەکی گۆڕستانەکە و ناوچەکە و کەس و کاری خوشکە سریعەمان کرد، ماڵی مەلا محرم.

(١١)

## گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی تری ژەهر (سالیۆم) لە لایەن کاک قادری حاجی عەلی

ئەوەی کە پەیوەندی بە کاک قادری حاجی علی یەوە هەیە لەم تێمایە بریتیە لە دوو ڕوداو:

ڕوداوی یەکەم:
ئستیخباراتی عێراقی خەڵکی خۆی هەبوو لە ناوچەی قەرەداغ. ئەم ناوچەیەش تۆزێك قەڵەبالغ بوو ئەو کاتە. خەڵکی لەوێوە هاتوچویان دەکرد. پێشتر کەسێك هات و زانیاری بۆ هێنام، و وتی ژەلامێك دەنێرن.ناوەکەی دامێ لەگەل نیشانەکانی تەمەن و ڕەنگ و شێوەی. ووتی بەڵام ناوی خۆی گۆڕیوە. هەوێیەکی ئەحوالی مەدەنی پێیە بە ناوێکی ترەوە کە ناوی خۆی نیە. شەرواڵێکی ڕەشی لە پێدایە لەگەڵ کراسێکی سپی. چەند کەسێك لە لای تۆ دەناسێ و دەیەوێ بێتە پێشمەرگە لای تۆ. ئاگاداری کردین کە ژەهری پێیە. بە ئەواویش پێی وتین کە لە کوێی شەرواڵەکەیدا دانای ناوە. پێی ووتم کە فلان کەس لە سلێمانیەوە ناردویەتی. ئەو کەسەش بە داخەوە کۆنە هاوڕێی خۆم بوو کە ببوە ئیستیخبارات.

منیش بە جیهاز لەگەل قەرەداغ قسەم کرد. ئەو کاتە کاك شێخ جەعفەر لەوێ بوو. پێم ووت لەبەر دەم خەڵك قسە مەکە و بجۆرە قەراغ جادەیەك با کەس گوێی لێ نەبێت. پێم ووت کەسێك دێتە ناوچەکە و ناونیشانەکەیم بۆ هەڵدا. ناوە تەواو، و نا

تەواوەکەیم پێ ووت. لە فڵان ئوتومبیلدایە، بیگەڕێ و ژەهری پێیە. دوای سێ چارەکە کاتژمێرێك کاك شێخ جەعفەر جیهازی بۆ کردمەوە و وتی کابرا گەیشتوە و لای منە. ووتی زانیاریەکە ڕاستە و ژەهری پێیە و لێشمان سەندوە. ئەو کاتە بڕیار وابو هەر کەسێك ژەهر بهێنێت و مەبەستی کوشتنمان بێت فەرمانی کوشتن بدرێت بەسەر ئەم جۆرە کەسانەدان بەڵام بە مەرجێ ئاگاداری سەرەوە بکرێ و شایەت هەبێ و خەڵکی ئاگاداری بێ لێی و حاکمە کانیش لە مەسەلەکەدا بن کە ئەم شتە بە عەمد نەکراوە. دوای ئەوە بەبەرچاوی خەڵکەکەوە ڕەمییان کردبو بۆ ئەوەی خەڵکەکەش بزانێت. پاش ڕەمی کردنی ئەم کەسە زانرا کە شەبەیەك هەیە لە قەرەداغ کە لێپرسراوەکەیان پیرێژنێك بوو. ئەم پیرێژنە کۆمەڵێك خەڵکی گەنجی هەڵخەڵەتاندبوو، و هاتوچۆی شاری دەکرد چونکە گومانمان لێ نەدەکرد. ژەهر و پارەشی بۆ هێنابوون. کە ئەوە بوو خەڵکیی زانیاری داینێ و ژەهرەکەش بریتی بوو لە سالیۆم.

لە چەمچەماڵیشەوە زانیاریەکم بۆ هات کە (امر سریەی خفیفە) بۆی ناردم، وتی ژەهرتان بۆ نێردراوە بۆ کوشتنی خۆشت و ئەندامانی مەڵبەند، و وتی کەسێك لەم شێوەیە تاقیبی ناوچەکەتان دەکات. بزانن کێیە ئەو هێناویەتی. وتی ئاگام لێ بوو کە زابتی ئیستخباراتەکە هەم پارە و هەم ژەهریشی دایە. نیو کیلۆ ژەهری دا پێی. منیش نیتر کەوتمە تەعقیب کە کێ لەم شێوە و ڕەنگە هاتوچۆ دەکات و مەعلومە و زوو ئەدۆزرایەوە. بەم شێوەیە دۆزیمانەوە. ووتم هیچی لێ مەکەن و تەعقیبی بکەن. دوای ئەم تەعقیب کردنە بینرا کە کۆمەڵێك خەڵکی گەنج پەیوەندییان پێوە کردبوو. هەندێ لەم گەنجانە کە پێشتریش

جێگای گومان بوون، هەر خۆمان ڕێگامان دابوون کە لەو ناوچەیە دانیشن و کەفالەتمان لێ وەرگرتبوون.
کە ئەوەمان زانی ئیتر گرتمانن و تەسلیمی دەزگای مەڵبەندمان کردن. دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵیان ئیعترافیان کرد. پیرەژنەکە زۆر پیر بوو، هی ئەوە نەبوو کە ئیعدام بکرێ. ئەمان هێشتەوە. بەڵام دوانەکەی تر کە تەمەنیان ۲۲ و ۲۳ ساڵ بوو بە فەرمانی سەرکردایەتی بەبەرچاوی خەڵکەکەوە ئەمانەشمان کوشت لە قەرەداغ.

ڕوداوی دوەم:
پەیوەندی و ڕوداوی دوەمیان بە کێشەی زەهرەوە بە منەوە. ئەو کاتە لە ئێران بوین. لە مەڵبەندی دوو لێپرسراو بووم ئەو کاتە لە بلە کێ. حاکم قادر جیهازی بۆ کردم و وتی ئەگەر دێیتەوە بۆ بانە منیش لەوێوە دێمەوە و هەندێ ئیشم پێتە. وتم باشە. کە چومەوە بۆ بانە ماڵەکەم لەوێ بوو فیعلەن حاکم قادر هات. ووتی زەلامێکمان گرتوە لەسەر سنور لای قاسمە ڕەش کە سەر بە یەکێك لە سەرەك جاشەکانە ، شێخ عەزیز. ئێستەش هەر لە بەغدایە و سەر بە دەزگای موخابەراتە. ووتی ئەم جاشەمان گرتوە و هاتوە بۆ جاسوسی، بەڵام ئیعترافی لەسەر شتێکی تر کردوە کە پەیوەندی بە تۆوە هەیە. ووتم چیە ئیعترافەکە. ووتی دەڵێ: " ئێمە کاتی خۆی یەکێکمان تەجنید کردوە لە مەفرەزەکەی ئەو - کاك قادر - کە لە قەراغ بوین. زەهرەکەی بۆ بردۆتە ماڵی خۆی و هەر ئەوە ماوە بیکاتە ناو چێشتەکەوە بۆی. بروسکەیەکم بۆ هاتبوو لەسەر مەسەلەی ئەنفال کە بەپەلە هێز بەرم. دەڵێ ئەو بروسکەیە ڕزگاری کردو ن ئەگینا خۆی و ماڵ

و منداڵیشی لەگەڵ پێشمەرگەکانیش دەکوژران و کابراش مەجالی ڕاکردنیشی بۆ خۆی دروست کردبوو.

منیش خولیای ئەم شتەم کەوتە سەر و دەستم کرد بە تەعقیب کردن لەوە کە ئەو کاتە کێ لای من بوە، کێ لە دەستەکەی من بوە و کێ نزیك بوە، و کێ هاتۆتە مەتبەخەکە...؟
تەنانەت گومانم لە چەند پێشمەرگەیەکی خزمی خۆیشم کرد. یەکێك لەو پێشمەرگانە زۆر خۆبەرەپێشەوە بوو. تەعقیبی ئەم کەسەم کرد و فیعلەن ئەم بوو. ئەم کەسە ئێستەش هەر ماوە. ئەو کاتە لای ئێمە نەمابوو کە ئیجراتاتی لەگەڵ بکەین. داماننا بۆ زەمانێکی تر. لە ڕاپەڕینەکەش لێبوردن بۆ هەموو کەس دەرکرا. ئەم یەکێك بوو لەوانەی ڕەنگە لە پێش هەموو کەسێکی تردا هاتبێ بۆ بەخێرهاتنەوەم، بەڵام ئەو هەتا ئێستە نازانێ بەوە کە من زانیاریم هەیە. هەتا ئێستەش ئەم شتەم پێ نەوتوە، چونکە لەسەر شتی شەخسییش تۆزێ ناخۆشە، شەخسیی بوو شتەکە. ئێستەش هەر ماوەو لێرەیە. ئیتر ئەو بروسکەیە ڕزگاری کردبووم. بەڵا م کاتی خۆی زەهرەکەی هێنابوە ناو مەتبەخەکەمانەو ن بەڵام باش بوو کە نەیکردبوە خواردنەوە بۆ ماڵ و منداڵەکەم چونکە شتەکە زیاتر بۆ خودی خۆم بوو، و وەك خۆی مایەوە و وازی لەوان هێنابوو.
ئەم دوو ڕوداوە بوون کە پەیوەندی بە من خۆمەوە هەبوون سەبارەت بە کێشەی زەهر خواردنەوە.

(١٢)

## ڕووداوەکەی مەرگە و یاساکانی مافی مرۆڤی یەکێتی نەتەوە یەکگرتوەکان

لیژنەیەکی تایبەتی مافی مرۆڤی UN لە ١٩٩٦/٢/٢٢ لە شاری جنێف سەبارەت بە پێشێل کردنەکانی مافی مرۆڤ لە عێراق ڕاپۆرتێکی پێشکەش کردوە، و لێرەدا ئیسپاتی تەواویان هەیە کە تەنانەت شەخسی سەرۆکی عێراقی (سەدام حسێن) لێپرسراوە لە کوشتن و پێشێل کردنەکانی مافی مرۆڤ.

لیژنەی مافی مرۆڤی UN یەکێك لەو ئەشکەنجە و ئازارانەی کە باسی کردوە کوشتنە بە ژەهری سالیۆم.

لە یاساکانی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتوەکاندا کە لە ١٩٤٨/١٢/٩ دا تۆمار کراوە، جینۆساید لە گشت خاڵەکانیدا پێناسە کراوە کە بە ئامانجی وێران کردنی سەرجەم یان بەشێکی نەتەوەیەك، کەمایەتیەك، ڕەگەزێك یان گروپەیەکی کۆمەڵایەتی و ئاینی ئەنجام بدرێن:

أ) کوشتنی ئەندامانی کۆمەڵگا

ب) بونە هۆی زیانی گیانی،یان دەرونی

ج) بە عەمدەن شێوەیەکی تری ژیان بەسەر ئەو کۆمەڵگایەدا بسەپێنێت کە پێشتر دەزانرێت کە دەبێتە هۆی خوڵقاندنی وێران کردنی گیانیی سەرجەم یان بەشێکی کۆمەڵگاکە.

جاڕی گەردونی مافی مرۆڤ کە لە ١٩٤٨/١٢/١٠ وەرگیراوە بڕیاری ئەوەی تێدایە:... کە شتێکی جەوهەریە مافی مرۆڤ بە ڕێگای دەسەڵاتی ماف بپارێزرێت بۆ ئەوەی مرۆڤ لە دژی دڕندەیی و چەوساندنەوە ناچاری ڕاپەڕین نەبن وەك دوا ئامرازی بەرگری کردن لە خۆ.
لەبەر ئەوەی مافی مرۆڤ لە کوردستان نەپارێزراوە گەلی کورد ناچار بوە بۆ بەرگری کردن و ڕاپەڕین لە دژی دڕندەیی و چەوساندنەوە لە نمونەی ئێرەماندا کە ڕژێمی عێراقە وەك دوا ئامراز ڕێگای وەڵامدانەوەی گونجاو هەڵبژێرێت.

لە مادەی یەکی دا دەڵێت: " هەموو نەتەوەیەك مافی دیاری کردنی چارەی خۆ نوسینی هەیە... کە لە ئازادیدا گەشە بە مافی سیاسی،ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتوری خۆی بدات"
مانای بە پراکتیزە کردنی مافی چارەنوس بە مەرجی بوونی وەجهە نەزەرەکانی سەرەوە بەندن.

مافی چارەنوس بە بەدەست هێنانی سەربەخۆیی کۆتایی نایەت، بەڵکو لە دوای بەدیهێنان و دانی تەواوی سەربەخۆیی یاسا و سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتوری دەبێت.
بەدەستهێنانی مافی چارەنوس مەرجێکی پێویستە بۆ (وجودی فیعلی) مافی مرۆڤ و سەربەستیە سەرەکیەکان.
هەموو ئەندامێکی نەتەوە یەککگرتوەکان ڕێگا پێدراوە پشتگیری لە مافەکانی نەتەوەی کورد بۆ دیاری کردنی مافی چارەی خۆ نوسین بکات.

له بڕیاری ژماره ١٩٠٤ی ١٩٦٣/١١/٢٠ دەستگای ناوەندی نەتەوە یەکگرتوەکان ڕازی بوە بە وەرگرتنی بڕیاری نەهێشتنی هەموو جۆرێك لە ڕەفتاری ڕەگەزپەرستانە.
ئەمانە تەنیا چەند نمونەیەکی زۆر کەم بوون بۆ یاساکانی نەتەوە یەکگرتوەکان کە مەرجەکانی دەست درێژ نەکردنی بۆ مافەکان دیاری کردوە کە کوردیش هەر وەك هەموو میللەتەکان و ئەندامەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان مافی بەکار هێنانی هەیە.

عێراقیش ئەندامێکی نەتەوە یەکگرتوەکانە و ئەم یاسایانەیان ئیمزا کردوە. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە ڕژێمی عێراقی بە توند ترین شێوە ئەم ڕێککەوتنەی پێشێل و بریندار کردوە، وە یەکێتی نەتەوە یەکگرتوەکانیش وەك دامودەزگاکە خۆی هیچ کات هەنگاوی پێویست و جیدیان نەناوە بۆ مەودای دوور بۆ ئەوەی کورد بپارێزن.

یەکێتی نەتەوە یەکگرتوەکان تەنانەت ڕژێمی سەدام حسێنی مەحکوم نەکرد بۆ بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی لە هەڵەبجە کە بوە هۆی شەهید کردنی زیاتر لە ٥٠٠٠ ژن و منداڵ و مرۆڤی کورد، چونکە ئەم دامودەزگایەی یەکێتی نەتەوە یەکگرتوەکان زیاتر لە ژێر سیاسەت و تەنسیری ئەمریکادا دەچێت بە ڕێگاوە، و سیاسەتی ئەو کاتەیان وای پێویست کردوە بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن.

بەڵام ئێستە لەبەر ئەوەی کە ئەمریکا لە سیاسەتی عێراقیدا دژ بە سەدام حسێنە بەڵگەنامەی پێویستیان بۆ کۆکردۆتەوە کە بیدەن بە دادگای نێودەوڵەتی.

ئەگــەر دامودەزگاکـــانی یـــەکێتی نەتـــەوە یـــەکگرتوەکان وا دادپەروەرانە بێت کە ئەو تیۆریانەی لەسەر کاغەز نوسیویەتیەوە بۆ پارێزگاری کردنی مافی مرۆڤ و نەتـەوە و کەمایەتیـەکان، ئەگـەر تـەنیا یـەك مرۆڤیش بێـت و دەوڵـەتێکی وەك عێراقیـش ئیمزای کردوە و ئەندامیەتی و پارەی ئەندامـەتیش ئـەدات تێیـدا ئەوا دەبێت ئەو مرۆڤانـەی کـە بـە پیلانـی رژێمـی بـەغدا ژەهـر خـوارد کـراون و سـەلمێندراوە لـە سـەریان،بتوانـن لای ئـەم دامودەزگایانە شکات لە گوناهباران بکەن و داوای دادگا کردنی نێودەوڵەتییان بکەن. بەڵام ئایا ئەم دامودەزگایە چەند بەرگری لە هەڵەبجە کرد و چەند سەدامی مەحکوم کرد بۆ کارەساتی ئەنفال و وێران کردنی زیاتر لە چوار هەزار دێهاتی کوردستان،هەتا ئێستە بیەوێت مافی چەند هاوولاتیەکی تر بسەنێت کە بەم شێوە نامرۆڤانەیە کراونەتە قوربانی. ئایا ئەم مرۆڤانە و زۆری کەش ئەندامی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەم سەر زەمینە نین، و بەر یاسا نێو دەوڵەتیەکانی یەکێتی نەتەوە یەکگرتوەکان ناکەون کە ئەرك و مافیشی بۆ تاقە مرۆڤەکانیش دیار کردوە؟

جا بۆیە ئێمەش پێویستە یاسا بـۆ خۆمـان دروست بکەین کە ببینە خاوەن کیان و ئامرازە حەساسـەکانت لـە ئابوری و جیۆپۆلـەتیك خستە ژێر دەسەلاتی خۆتەوە ئەو کاتە باشتر حیسابت بۆ دەکەن و بەرژەوەندیەکانی دەرەوە زیاتر دەخەیتە بەر مەترسـی و بـەم شێوەیەش سـەرنجی دەرەوە زیـاتر بـە لای خۆتـدا ڕادەکێشـیت. هـەر بۆنمونـە ئەگەر لـە باشـوری کوردسـتان کـورد یەکبوایـە و ئـابوری هاوبەشـی خـۆی بـەهێز بکردایـە و لەسـەر پرۆسـەی دیموکراسی هەڵبژاردنیش بەردەوام بوایە، و شاری نـەوتی وەك کـەرکوکیش لـە چنگدا بوایـە بـارودۆخی کـورد لـەم بەشـەی

کوردستاندا شێوەیەکی تری بە خۆوە دەگرت. گرنگە کە خاکت بە دەستەوە بێت و لەسەری خاوەن دامودەزگای دامەزراو بیت.

ئەوەی کە دوێنێ ئەم دامودەزگایانە بە تیرۆریست ناویان دەبردن ئەمڕۆکە زل هێزەکانیش وەك کەسایەتی ناودارو و سەرۆکی نێو دەوڵەتی پێشوازییان دەکەن و فەرشی سوور لەبەر قاچیان دادەخەن. یاسر عرفات و ماندێلا تەنیا دوو نمونەی زیندون، و مێژووش ئەوەندە سەیروسەمەرە کە هیچ دوور نیە سەدام حسێنیش نەیەتەوە سەر ئەم فەرشە سورە.

بە هەموو شێوە مێتۆدیەکان و سیستێماتیك مافی ئەوە لە گەلی کورد سەندراوەتەوە کە بتوانێت بە بێ دەستێوەردانی دەرەوە بڕیار لە قەوارەی سیاسی خۆی بدات و پێکهاتەی گەشە کردنی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتوری خۆی دابڕێژێت.

بوونی گەرەنتیەکی نێودەوڵەتی بۆ مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان باس نیە. مافی ژیان، سەربەستی و سەلامەتی، پاراستنی کەرامەت و دەربڕینی ماف و بیروڕا، وە کە بە زمانی خۆی قسە بکات، بڵاوکراوەی هەبێت، وە مافی گەشە کردن لە تەکنەلۆژیا و زانست و پێویستیە ژیانی و میللی و ڕۆحیەکانی تریش، ئەمانە هەمووی لە کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی دوژمن دا نەدراون. بەمە گرنگترین سەرەتاکانی مافی مرۆڤ لەو بوارانەی کە پێشتر ئامارەم بۆ کردن لە نەتەوەی کورد دزراون.

لەبەر ئەوەی ڕژێمی عێراقیش ئیمزای ئەندامەتیەکەی خۆی لە نەتەوە یەککرتوەکان بەجێ ناهێنێت و ڕێککەوتنە نێودەولەتیەکانی سەبارەت بە مافی مرۆڤ،و بە تایبەتی هی کوردی پێشێل کردوە، گەلی کورد ناچاری ئەوە بوە کە بە شوێن بەدیلێك (ئالتەرناتیڤێك) دا بگەڕێت بۆ بەدیهێنانی ئەو مافانەی،وەك مرۆڤ،و وەك نەتەوە. ئەم بەدیلەش تەنیا هەلگری ڕێگای خەباتی دوورودرێژ خایەن بە چۆنایەتیەکی باشەوە بوە کە بتوانرێ بەم مەودا دوورودرێژە بەرژەوەندیەکانی ڕژێمی عێراق و ناوچە و نێودەولەتیەکان بخەنە ژێر مەترسیەوە و سەرنجی جیهان بە لای خۆیان دا ڕابکێشن و هەروەك ئامازەم بۆ کرد حسابێکی جدیمان بۆ بکەن.

ئەم هەڤالانە بۆ بەدیهێنانی ئەو مافە بیرۆزانەی مرۆڤ، خۆشەویستترین شتی خۆیان پێشکەشی نەتەوەی کوردی کرد کە گیان و ژیانی خۆیان بوو، کە لەسەر ژیان و خوێنی هەزارانی وەك ئەمان بە ملیۆن مرۆڤی تر لە ئێستە و لە ئەوەی داهاتودا ژیانێکی ئازاد و سەربەست و بە کەرامەت بتوانن بژین وە بۆ خۆشیان وەك مرۆڤ لەسەر خاك و وولاتی خۆیان.

هەر بۆیە لەسەر ئەم خاکەش خەباتیان کردوە، چونکە چەندین فاکتەری زمان و کولتور و بیرەوەری و ئاین و مێژوو وە پەیوەندی قولیان بە نەتەوەی خۆیان و خاکیانەوە هەیە، و هەر لەسەر ئەم خاکەش مال ئاواییان کرد، و ئەوانەیشی کە زامدار بوون لە ئازاری شەهیدەکانیان و ئازاری نەتەوەکەیان دا دەژین.

بەڵێ، زمان کە مرۆڤ لە ساڵانی زووی ژیانی منداڵیدا بە هۆیەوە لە جیهانی دەوروپشتی خۆی دەگات، زمانی دایك و باوکی و خوشك و براکانی و خزمەکانی و هاوڕێکانی فاکتەرێکی مەرکەزی نەتەوە ناسینەوەیەتی.

بەم زمانە دۆست و دوژمن لە یەکتر جیا دەکاتەوە، قسەی پێ دەکات و دەوروپشتەکەی لێی تێ دەگەن و گەورە دەبێت. بە لەناو بردنی زمانەکەی، مانای کولتورەکەیشی لە ناو دەبرێت و مرۆڤ خودی خۆی و ناخی و گەشە کردنی و مەرجی نەتەوەیی لە ناو دەبرێت. بۆیە پاراستنی سەرەتاکانی مرۆڤ بریتیە لە پاراستنی ئەم سەرەتا کولتوریانەش.

شەهید و ئەنفالەکان و زامدارانی کوردستان، و هەموو مرۆڤێکی کورد بەم زمانە هەست و ئازارەکانی خۆیان تەعبیر کردوە، بەم زمانە خەفەتیان بۆ خۆیان و کوژراوەکانیان خواردوە و بە ملیۆن جار فرمێسکیان هەڵڕشتوە، وە هەر بەم زمانەش دوا ماڵ ئاواییان کردوە.

جا ئەوەی کە بەم زمانە قسە بکات کە تەعبیر لە زمانی نەتەوەیەکی دڵ بریندار و نەتەوە و خاك داگیر کراو دەکات، و بە ناشیرینترین شێوەکان لەناو دەبرێت و دەربەدەر و کۆچ و ڕەو پێ دەکرێت، خیانەت بکات، ئەوا ئەوە خیانەتە لە خۆیشی و کەس و کارو بنەماڵەکەیشی، کە تێنەکۆشێت بۆ پاراستنی ئەم زمان و کولتور و مێژوەی خۆی، کە بە بێ ئەم سەرەتایە مرۆڤێکی کوژراو و بێ بونە. خیانەت کردنیش لەم پرەنسیبانە، خیانەتە لە کەرامەت و شەرەفی ئەو مرۆڤە خۆیشی.

ئەو ڕۆژەی کە کورد وەك نەتەوەیەك ئازاد و سەربەخۆ بوو، وە لە ژێر پۆستاڵی دوژمنەکەی نەما ئەوساکە ئاساییە کە شێوازی تێکۆشان و بەرگری کردنەکەی بگۆڕێت و هەنگاو بۆ پێشکەوتنی شارستانیانە بدات بۆ سەردەمی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی کە ئێمەش لەو کاروانە دوا نەکەوین،بەڵام بۆ گەیشتن بەو کاروانە پێویستە پێشتر مەرجەکانی تری ژیان و نان و ئازادی بە دەست بهێنین، و ئەوەندەش زووتر ڕزگارمان ببێت ئەوەندەش کەمتر وولاتمان وێران دەبێت و نەتەوەکەمان کەمتر لە ناو دەبرێت. ئێمە لە باشوری کوردستان لە خەباتی شاخەوە هاتینە ناو خەباتی شارو دروست کردنی دامودەزگا و حکومەتی هەرێم. بەم شتە مێژوومان هەنگاوێك بردە پێش، هەرچەندە کولتوری حوکمڕانیشمان نەبووە، هەروەك ئەو پەندەش دەڵێت" شەڕو جەنگ کردن زۆر ئاسانترە وەك لە بردن بەڕێگای ئیدارەی دەوڵەت".

بە خوێن و کۆششی دەیان هەزار مرۆڤی پاك و بە وەفای کورد گەیشتینە ئەوەی کە لەسەر بەشێکی زەوی و نیشتیمانی خۆمان فەرمانڕەوا بین و پێویستە بە هەموو نرخێك ئەم بارودۆخە بهێڵینەوە و گەشەیشی پێ بدەین، تا دوبارە ڕوو نەکەینەوە شاخە عاسیەکانی کوردستان، چونکە سەردەمی ئەمڕۆی جیهان وایە کە حیسابت بۆ دەکەن ئەگەر خاك و شارو ئابوری و کارگە و ناوچەی ستراتیجت بە دەستەوە بێت و دامودەزگا بیت و قەوارە و کێشت هەبێت...

لەم سەدەیەدا لە ئاسیاو ئەمریکای لاتینی و ئەفریقیا بە دەیان نەتەوە لە کۆت و زنجیری کۆلۆنیالیزم و چەوساندنەوە ڕزگاریان

بوه، ئێمەی کوردیش هەرچەندە بە هۆی شوێنەواری جوگرافیمانەوە و ئابوریەکەیەوە ڕزگار بوونی گرانتر بوە، بەڵام یاسای سروشتە زوو یان درەنگ هەر دەبێت بگەینە ئامانجەکانی خۆمان کە ئەویش دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسینە بە دەستی خۆمان، چونکە ماف لەم بوارەدا دەسەندرێ نەك ئەدرێ.

دەبا لە خۆمانەوە دادپەروەری بسەلمێنین و بە یەکسانی ئابوری و کۆمەلایەتی و یاسای مرۆڤ پارێز و پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی و دادپەروەریی و بڕوای خەڵکی کوردستان بۆ خۆمان ببەینەوە و لە ڕۆژانی تەنگانەدا پشت نەکەنە بزوتنەوەکە و پارت وڕێکخراوەکانی و بێ بڕوا نەبن بەرامبەری و ڕاستگۆ بین لەگەڵیاندا،چونکە میللەت بە زەبرە و دوبارە ڕێگا گرتنەوەی مەسیرەی ڕزگاری هەروا ئاسان نابێت، هەرچەندە هەموو نەتەوەیەك بە تەجروبەی خۆیدا دەڕوات و دەبێت دەرسی گرنگی لێ وەربگرێت.

هیچ دوور نیە ئەوانەی دوێنێ چەوساوە بوون ئەمڕۆکە بە شێوەیەك لە شێوەکان ببێتە چەوسێنەر و لە سەرەتا و ڕێبازەکانی خۆی لابدات. هەر بەم شێوەیەش چەوساوە دروست دەبێت کە ئەمیش دوبارە لە دژی چەوسانەوە دەجەنگێت و بەم شێوەیە مرۆڤایەتی بە مەسیرەی خۆیدا دەڕوات. بەلام دەکرێت ئەم مەسیرەیە کورت بکەینەوە بەو شێوەیەی کە پێشتر لە باسەکەدا لێکۆڵینەوەم دەربارەی کرد.

ئێمە هەمووومان بە باش و خراپمانەوە، بە ڕۆشنبیرو نوسەر و شاعیر و... بە حیزبی و سیاسی و تا سیاسیمانەوە بەرهەمی

واقیعی ئەم کۆمەڵگا و وولاتەین، بەرهەمی باروودۆخی کولتووری و کۆمەلایەتی و سیاسی دەوروپشت و سیستەمەکانمانین کە ئەمەش زۆرجار ڕەفتار و دیاردەکان باشتر ڕوون دەکەنەوە. ئەدۆلف هیتلەر سەرکردایەتی حکومەتێکی فاشی لە ئەڵمانیا کرد و هەڵگیرسێنەری جەنگێکی جیهانی بوو بە هەموو ئەنجامەکانیشیەوە. بەڵام ئایا هەر هەمان ڕژێمی هیتلەر ئەمڕۆکە دەتوانێت فەرمانڕەوایی ئەڵمانیا بکات بەو سیاسەت و ئایدیۆلۆجیەتەیەوە؟. نەخێر ناتوانێت. بەڵام سەدام حسێن کە لە ڕژێمی هیتلەر باشتر نیە بۆچی توانیویەتی ۳۰ ساڵ بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی نەتەوەیەکی کۆیلە کراو بکات. چونکە سەدامیش بەرهەمی واقعی ئەمڕۆی عێراق و میللەتانی عێراق و ناوچەکەیە، هەربۆیەش دیکتاتۆرترو خوێنڕێژترە وەك لە دیکتاتۆرەکانی تر. بۆیە پێش دەست دانە هەر شتێك مرۆڤ پێویستە بە ووردی و زانستانە لە دیاردەو کێشە و پێکهاتەی ڕۆژگار بکۆڵێتەوە و لەسەر ئاستی ئەو ڕاستی و واقعە نەخشەکان دابڕێژێت.

(١٣)

## چەند بەسەرهاتێکی تری تراژیدیای سالیۆم لە عێراق

١

### کوشتنەکەی مجید جهاد بە سالیۆم

لە ناو ڕووداوە زۆرەکانی کوشتن بە سالیۆم لە عێراق من تەنیا دوو نمونە هەڵدەبژێرم، وە هەروەها ڕاستی تواندنەوەی مرۆڤ لە عێراق لە حەمامی تێزاب دا،بۆ ڕونکردنەوەی ئەو ڕاستیەی کە ڕژێمی بەغدا نەك هەر دوژمنی کوردە بەڵکو هی هەموو گەلانی عێراقە.

ڕوداوی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ١٦ ساڵ لەمەوبەر: مجید جهاد یەکێك بوو لە ئۆپۆزیسیۆنەکانی عێراقی. لە ساڵی ١٩٨٢ بە تەمەنی ٤٠ ساڵی لە لایەن ڕژێمی عێراقی یەوە دەگیرێت. لە دوای ساڵێك ئەشکەنجە و ئازاری دەرونی و گیانیی لە دەزگای (امن العامە) مجید جهاد حوکمی حەوت ساڵ دەدرێت بەسەردا کە لە بەندیخانەی ابو غریب دەیباتە سەر. لە دوای بەربونی دەبینێ کە کچەکەی توشی نەخۆشی شەلەل بووە. دوکتۆرەکانی بەغدا لە توانایاندا نابێت چارەسەری داودەرمانی پێویست بدەن بەم منداڵە نەخۆشە و دەڵێن چارەسەری پێویست تەنها لە دەرەوەی وولات دەکرێت. لەبەر ئەم هۆیە مجید جهاد بە ڕەسمی داواکاریەك پێشکەش دەکات بۆ لابردنی قەدەغە کردنی سەفەر لەسەری بۆ دەرەوەی عێراق و پەساپۆرتێکی بدەنێ تاکو بتوانێ کچەکەی بۆ چارەسەر بباتە دەرەوەی وولات.

لە کۆتایی مانگی ١٩٨٠/٣ مجید جهاد بانگ دەکرێت بۆ (مدیریە الامن العامە) و پێی دەووترێت کە (مجلس قیادە الثّورە) قەدەغە کردنی سەفەری لەسەر هەڵگرتوە. لە کاتی ئەم وتووێژەدا پەرداخێك شەربەتی پرتەقالی بۆ دادەنێن کە نیوەی لێ دەخواتەوە. هەر هەمان ڕۆژ پەیوەندی بە (دائرە الجوازات) دەکات بۆ تەواو کردنی پێویستیەکانی سەفەری . لە دوای چەند کاتژمێرێك مجید جهاد هەست بە ناخۆشی دەکات لە خۆیدا. ژەهرەکە هەر لە هەمان ڕۆژدا کاری خۆی دەکات. دەچێتە لای دوکتۆر و چەند دەرمانێکی ئەدەنێ، بەڵام نەخۆشیەکە خراپتر دەبێ و چەند دیاردەیەکی کەشی دەچێتە سەر وەك لە هۆش خۆ چوون، لاوازی و خراپ بینین و ... هتد. لەبەر ئەم هۆیە داوا لە کەس و کاری دەکات یارمەتی بدەن بۆ زوو تەواو کردنی معامەلاتی سەفەر بۆ چوونەکەی بۆ لەندەن.

لە دوای گەیشتنی لە لەندەن یەکسەر لە ١٩٨٠/٥/٧ لە نەخۆشخانەی Westminster Hospital دەچێتە ژێر چاودێری دوو دوکتۆر و دەخەوێندرێت. چەند شارەزایەکی کەش خەریکی دەبن و ڕاپۆرتێکی پزیشکیی دەبێت ڕاستی ئەم ڕوداوە ڕوون بکاتەوە. لە یەکەم لێکۆڵینەوەی پزیشکیدا دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە نەخۆشەکە توشی جۆرە نەخۆشیەکی جگەر بووە. بێ ئەوەی هۆکەی دیار بێت. لەم بەینەدا مەجید جهاد توشی نیو مشەوەشی دەبێت. بۆ دوکتۆرەکان ڕوون دەبێتەوە کە مەجید جهاد توشی نەخۆشیەکی ترسناك بوە، هەموو پێستی توشی ئیلتیهاب بوە لە جۆری (ستافیلۆ) دوکتۆرەکان دەگەنە ئەوەی کە ئیلتیهابەکەی ئەنجامی تەسەمومێکە لە خوێندا.

لە دوای گەڕانێکی سەخت و فەحس و لێکۆڵینەوە زیاتر لە ٢٠ دوکتۆر دەگەنە یەك ئەنجام کە ڕێژەیەکی زۆر لە سالیۆم لە خوێن و میزی نەخۆشەکە بەدی دەکرێت. مەجید جیهاد دیارە دەبێت ڕێژەیەکی نائاسایی لەم ژەهرەی لە شەربەتەکەدا خواردبێتەوە. شارەزایانی ژەهری نێو نەتەوەیی بەمە دەڵێن - ژەهری عێراقی - چونکە ستروکتورەکەی ( مرکبات ) لەوەو پێش نەدۆزرابونەوە.

ڕێژەیەکی کەمی بەسە بۆ ئەوەی لەش وێران بکات وە بێ ئەوەی شوێنەوارێك جی بهێڵێت. بە هەوڵ و هیلاکی و ئالۆزیەکی زۆر و بە یارمەتی دەزگای مۆدێرن ئینجا دەتوانرێ ئیشارەی بۆ بکرێت. لەگەل ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی کە دوکتۆرەکان بۆ مەجید جهادیان دا، بەڵام بارودۆخی تەندروستی بەرەو زۆر خراپی ڕۆیشت.

لە ١٩٨٠/٥/١٤ قژی کەوتە ڕوتاندنەوە و ئەمەش بۆ دوکتۆرەکان نیشانەیەکی تەواو بوو بۆ سالیۆم. لە ١٩٨٠/٨/٢٥ مجید توشی ئیاتیهابی سی دەبێت و لە ١٩٨٠/٦/١٦ لە

کاتژمێری ٢،٤٠ ئۆپۆزیسیۆنی ڕژێمی عێراقی مجید جهاد لە ئەنجامی ژەهر خواردن، بە سالیۆم بە ئەشکەنجە و ئازارەوە مرد و گیانی سپارد بە خاك. (دوکتۆر Ronald zeegen لە ١٩٨٠/٦/٢٥ لە خەستەخانەی ناوبراوی سەرەوە ڕاپۆرتی کۆتایی پزیشکی لەسەر نوسیوە و لای نوسەر هەیە).

ب

## کوشتنی ئەفسەری عێراقی بە سالیۆم

ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرە گەورەکانی سوپای عێراقی کە لە کات و دوای جەنگی کەنداو کەم وەفاو کەم کردار بەرامبەر بە رژێم دەرکەوتن بە سالیۆم لەناو بران. بەم شێوەیە توانرابوو بە ئاسانی و بێ ئەوەی مەسەلەکە گەورە بکرێ لە ناویان بەرن.
ئەم زەهرەیان بۆ کردبونە خواردنەوە. کتوپڕ نەخۆش کەوتبون و بەو هۆیەوە دەبوایە لە سوپا بنێردرێنە دەرێ. بێگومان پێش تەقاعود بونیان بەهۆی نەخۆشیەکەیانەوە نە بۆ کارو خزمەتە زۆرەکەیان بۆ گەلی عێراق سوپاس کران وە نە هیچیشیان درانێ

لەتیف یەحیا، هاوشێوەکەی عدی سەدام حسێن شایەتیی ئەوە ئەدات کە پاسەوانی شەخسیی سەدام حسێن (سەباح میرزا محمود) یشیان بە زەهری سالیۆم کوشت کە لە ژووری بەندیخانەکەی بە دەرزی لە قۆلیان دابوو.

شێوەو چەکی دەولی قەدەغە کراو نەماوە کە رژێمی سەدام حسێن بەکاری نەهێنابێت بەرامبەر دانیشتوانی گەلەکەمان. لە سالی ١٩٧٤ لە شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٧٤/١٠/٢١ لە جەبهەی گەرووی هۆمەر ئاغا رژێمی عێراق بۆمبای فسفۆری بەکار دەهێنا. کاك زاهیر مە حمود لەگەل کاك محمود رەشید کاتی خۆی بە خەستی بریندار بوون. دوو نمونە لە سەدان لە مێژووی شۆڕشی کوردستان دا. پاش دەیان نوژداری (عملیات) کردن هەر هێشتا شوێنەواری برینەکانیان دیارن.

لە ساڵی هەشتاکاندا لە شەڕی دژ بە ئێران، عێراق زیاتر لە ٥٠ هەزار سەربازی ئێرانی بە چەکی کیمیاوی کوشت. جگە لەوەی زیاتر لە ٥٠٠٠ هەزار مرۆڤی کوردی لە کوردستان بە غازی کیمیاوی شەهید کرد و بەشێکی کوردستانیشی بە چەکی کیمیاوی و ژەهر ڕژاندن بە دارو درەخت دا وێران کرد.
ئەمانە تەنیا چەند نمونەیەکی کەم بوون، چەند نمونەیەك لە سەدان کە دەبێت بخرێتە چوارچێوەی یەکێك لەو هەوڵی جێنۆسایدەی کە ڕژێمی عێراقی بە سەرۆکایەتی سەدام حسێن بەرامبەر بە میللەتی کورد و ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی کردویەتی و بەردەوام دەیکات.

ج

## تواندنەوەی مرۆڤ لە حەمامی تێزاب دا

کە لە سالی ١٩٧٧ کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان لە دەرەوەی وولات (AKSA) لە بەیانێکدا باسی ئەوەی دەکرد  کە لە عێراق ٢٧٦ مرۆڤ لە تێزاب دا توانراونەتەوە، ڕای گشتی ئەڵمانی گاڵتەی پێدەکردین. پاسەوانی شەخسی سەدام حسێن (کریم عبدالله الجبوری) لە دوای هەڵاتنی لە عێراق بۆ  فەرەنسا لە چاوپێکەوتنێکدا باسی  ناسیاوێکی باوکی دەکات کە لە (قسر النهایە) چۆن بە تێزاب توێنرایەوە. من لە  وەرگێرانی کتێبی من کوڕی سەدام بووم لە ئەڵمانیەوە بۆ کوردی بە تێروتەسەلی باسی ئەم ڕوداوانەم کردوە. دوای ئەوەی کە کریم الجبوری لەسەر داواکاری باوکی دراوسێ و ناسیاوەکەی ئادۆزێتەوە، ئەفسەرێکی لێپرسراو بە کریم الجبوری دەڵێت: " لەوانەیە لە تێزاب دا توێنرابێتەوە".

کریم دەڵێت: "باسی چی دەکەیت؟"

ئەفسەرەکە دەڵێت:" وەرە لەگەڵمدا و نیشانت ئەدەم کە باسی چی دەکەم".

ئەفسەرەکە دەیباتە بینایەکی ترەوە. دەرگایەکی کارەبا دەکرێتەوە و کریم الجبوری لەبەردەم پەنجەرەیەکی شوشەی گەورە دەوەستێت. بەم جۆرە ڕوداوەکە دەگێڕێتەوە:

" هۆلێك کەوتبوە پشتی پەنجەرە شوشەکەوە کە مەلەوانگەیەکی بە دیوار دەورە دراوی دەستکردی تیا دروست کرابوو کە  قووڵ چوبوە زەویەوە. مەلەوانگەیەکی پێنج بە پێنج مەتر کە بە

پـالکۆنێکی موحاجـەرەی ئاسـن دەروە درابـوو. مەلەوانگەکـە زەویەکی تاریکی چیمەنتۆ کراوی هەبوو وە لە ناو حەمامەکەوە بوخار هەڵدەستا (هەڵمی تێزاب). دیمەنێکی یەکجار سەیر بوو بـە لامەوە کـە ببینیم پاشمـاوەی ئینسـان هێشتا بەسـەر تێزابەکـەوە مەلەی دەکرد".
ئەفسـەرەکە پێـی ووتم: " ئـا ئـەو یەکـەیان پێش نزیکـەی دوو کاتژمێر لە تێزاب دا توێنرایەوە". بۆی باس کردم کە پێشـەکی دەست و قـاچی گیراوەکە نقومـی تێزابەکە دەکرێ و دوایی هـەر بە زیندویەتی فڕێ ئەدرێتە ناو حەمامی تێزابەکە.

دراوسێکەی ڕومادی یان هەمان چارەنوسی بەسەر هاتبوو. دانی پیادا نابوو کەبە هەڵە قاچی بەسەر پۆستەرێکی سەدام دا ناوە و بەسەریدا ڕۆیشتوە کە لە دیوارێك کەتبوە خوارێ. هـەر لەبەر ئـەم ڕوداوە ئەشـکەنجە و ئـازارێکی زۆریـان دابـوو. بـەڵام وێرابـوی شـکاتیان لـێ بکـات و جنێویـش بەوانـە بـدات کـە ئەشـکەنجەیان دابـوو. کریـم الجبـوری بەسـەر گێژیـەوە قەسـر الجمهوری چێ دێڵێ و هەستی ئەوەی دەبێت کە لە جیهـانێکدا دەژی کە پڕە لە شێت و مرۆڤـ پارچە پارچە دەکەن و ئەیدەن لە قیمە یان لە تێزاب دا دەیتوێننەوە هەر لەبەر ئەوەی بە هەڵە قاچی بە پۆستەرێکی لەسەر جادە کەوتوی خوساوی دا ناوە.

# ئایدیۆلۆجیەتی حیزبی بەعس و سروشتی صدام حسین

هەموو ئەو ڕوداو و تراژیدیایانەی کە من لەم کتێبەدا باسم کردون، یان لە مێژوی عێراق و کوردستانی عێراقدا ڕووی داون لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا ڕوویان داوە کە خراپترینیان ڕژێمێک ڕەفتاری کردوە بە ناوی بەعس و بە سەرکردەی کەس و بنەماڵەیەک بە ناوی سەدام حسێنەوە. سەدام و بەعس ناوێکن کە لە مێژوی کورد و عێراق دا دەچنە کتێبی مێژووەوە و لەسەر زاری خەڵکی ئەم وولاتەو ناوچەکەیە. کێیە ئەم پارت و ڕژێمە، و کێیە ئەم کەسایەتیە کە بتوانێت مێژو بە خوێن و ڕق و کین تۆمار بکات.

## - پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست -

- پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست لە ساڵی ١٩٤٢ لە لایەن صلاح بیتار و مامۆستای سانەوی میشل عفلق دروست کرا. سێ تاڵاکەیان بریتیە لە: وحدە، حریە و الاشتراکیە. بە کوردی (یەکێتی و سەربەستی و سۆسیالیزم). بە واتا یەکێتی هەموو وولاتە عەرەبیەکان، سەربەست بوون و ڕزگار بوون لە دەسەلاتی بێگانە. سۆسیالیزمیش لەسەر شێوەی عەرەبی و بیر کردنەوەی بەعسیانە.
حیزبی بەعس لەم ٥٧ ساڵەدا (وحدە و حریة و الاشتراکیة) تیان بە چ ئامانجێك گەیاند و ئەنجامەکانی چی بوون ڕوونە و پێویست ناکات دەربارەی بدوێم.

- ئایدیۆلۆجیەتی حیزبی بەعس لەسەر بیری ناتسیۆنالیزم (دەمارگیری نەتەوەیی) و شۆڤێنیزم دارێژراوە. میشل عفلق موعجیب بوە بە ئەدەبیات و ئایدیۆلۆجیەتی نازیەکانی ئەڵمانیا. ئەگەر لەگەڵ بەعس نەبیت بە واتا دژی ئەویت. فەلسەفەیان ئەوەیە کە دنیای عەرەب لە محیتەوە، لە ئۆقیانوسی ئەتلەسی لە مەغریبەوە بۆ کەنداو درێژ بۆتەوە، کە چەند نەتەوەیەکی تیا دەژین کە وەك کەمایەتی لە ناو خاکی عەرەب دا لە قەڵەم دەدرێن وە دەردەکرێنە پشتی سنورەکان ئەگەر کێشە بۆ نەتەوەی عەرەب دروست بکەن.

دوای هەوڵی کوشتنەکەی عبدالکریم قاسم کە صدام حسین ڕۆڵی تیا سەرەکی تیا بینیبوو وە لەو ڕوداوەدا قاچی برینـدار ببوو ڕادەکاتە سوریا و لەوێ شەش مانگ دەمێنێتەوە. هەر لەوێ لە سوریا میشل عفلق دامەزرێنەری حیزبی بەعس دەبێتە پەروەردەکەر و مامۆستای سیاسی سەدام حسێن.

حیزبی بەعسی عێراقی بە سەرۆکایەتی سەدام حسێن ئایدیۆلۆجیەتێکی شۆڤێنی و ڕەگەز پەرستی هەیە کە ڕقیان لە هەموو میللەتانی غەیرە عەرەبە لە کورد، تورکومان، ئاسوری و ئەرمەنی... وە کورد بە میللەتێکی غەریب دادەنێن لە ناو خاکی عێراق دا. هەرچەندە دان بە بوونی کورد دا دەنێن. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئاڵای لەناوبرندی بەرز دەکەنەوە. هەروەها خاوەنی فەلسەفەیەکی نازی یە، چونکە جگە لە ئایدیۆلۆجیەتی خۆیان ڕێگا بە هیچ پارت و لایەنێکی تر نادەن و دوژمنی گەورەی هەموو بیروباوەڕ و مەزهەبێکن لە دین و سۆسیال دیموکرات و کۆمۆنیست و هتد.

مەبەستی سەدام حسێن لە یەکێتی عەرەب ئەوەیە کە ببێتە (قائد الامة العربیة). بارودۆخی نەتەوەی عەرەب لە ژێر سایەی ئەم قائیدە زۆر باشتر نابێت وەك لەوەی کە گەلانی عێراقی تێدا دەژین.

ئەنالەت ڕۆژنامەی پراڤدای سۆڤیەتی هەروەك ئاماژەم بۆ كردوە لە ساڵی ١٩٦٣ دەسەڵاتدارانی عێراقی بەم شێوەیە پێناسە كردوە: "(حەرەس ـحەمەوری) یە بەعسیەكان... لەسەر شێوەی چەتە نازیە فاشستەكانی غەستابۆ دروست كراوە"..

## سروشتی صدام حسین

سەدام حسێن كێیە؟ كەسێكی دەروون نەخۆشە كە شێت و شەیدای دەسەڵاتە. خۆشی دەبینێت لە كوشتن و خوێن ڕشتن و بە كۆمەڵ مرۆڤ لە ناو بردن. بەتایبەت عدی لە ڕەفتار و سروشتی مرۆڤ كوشتن و نەخۆشی دەروونی هاوشێوەی باوكیەتی. سەدام كەسێكە كە بە بێ شەڕو جەنگ ناتوانێت بژی و تەنها لە باروزروفی شەڕدا هەست بە سەلامەتی دەكات. لەو كاتەوە ئەمانە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، شەڕیان بە دوای شەڕدا بەرپا كردوە، چ لە ناو عێراق یان لەگەڵ وولاتانی دەورویشت بوبێت.

سەدام هیچ كات ئامادەی ئەوەی تیا نەبوە دەسەڵات لەگەڵ هیچ كەس و لایەنێكی تر بەش بكات و مەبەستی یەكەم و سەرەكییان دەسەڵات و حوكمی تاكرەوی و تالانی و خۆ دەوڵەمەند كردن و نواندنی ڕەفتاری ناشیرینە بێ ترسی لێپرسینەوە. بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەن تەڕ و وشك پێكەوە بسوتێنن. خێزانی سەدام و بنەماڵەكەی، هەروەك

بنەماڵەی سۆمۆزای نیکاراگوا بە جۆرێك فەرمانڕەوایی عێراق دەکەن، هەروەك سەروەت و سامانی وولاتەکە هەمیشە هەی خێزانێك بوبێت. خاوەنی ٦٨ کۆشکن لە عێراق دا و میللەتانی وولاتێکی دەوڵەمەندیشیان کردۆتە سواڵکەر و کوێرەوەری و برسێتییان بەسەر ملیۆنەها مرۆڤ هێناوە و وایان لەم وولاتە کردوە کە جێگای مرۆڤی زانا و هونەرمەند و ڕۆشنبیرو لێهاتو و دیموکراتخوازی تێدا نەبێتەوە. دوای ئەو هەموو بەسەر هاتانەش کە بەسەر گەلانی عێراقیان هێناوە کەچی طارق عزیز بە ناوی موعاناتی گەلی عێراقەوە داوای لابردنی ئابلوقە ئابوریەکی سەر عێراق دەکات لە یەکێتی نەتەوە یەکگرتوەکان کە لە ڕاستیدا بۆ ئامانجی ئاکرەوی ڕژێمە جەلاد و هیتلەریەکەی بەغدای دەوێت، و تەنانەت لێرەشدا بازرگانی بە موعاناتی گەلانی عێراقەوە دەکەن.
لە هەمووشی سەیر تر ئەوەیە کە سەدام داوای خۆشەویستی دەکات لە گەلانی عێراق، لە کۆیلەکانی ژێر دەستی خۆی. لیستەی جەریمەکانی سەدام دوورودرێژن و پێویستی بە دروست کردنی ئینستیتوت و دامودەزگای لێکۆڵینەوەی تایبەت هەیە بە دەیان ساڵیش لە دوای ڕوخاندنیان بە هیوای ئەوەش کە مرۆڤایەتی هەنگاوێ بچێتە پێشەوە بۆ فێر بوون لە مێژووی خۆی.

جگە لەوانەی کە تێیدا تووشی زیان بوون کە ئەویش بە تێپەڕ بوونی ئەوەیەکی تر کەم یان زۆر لە یاد دەچێتەوە، چوونکە مرۆڤ بە داخەوە زوو ڕوداوەکانی مێژووی لە یاد دەچێت، ئیتر بۆ نمونە کێ ئەمڕۆکە باسی شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق دەکات کە زیانێکی زۆر گەورەی گیانی و ماڵی بۆ هەردوو وولاتەکە خولقاند، دوورودرێژ ترین جەنگ لە دوای شەڕی دوەمی جیهانیەوە لە نێوان دوو دەوڵەتی نیزامیدا، بۆچی و لە پێناوی چیدا کرا؟ ڕوداوەکان ئەوەندە خێرا دەڕۆن کە زۆری کە ناخایەنێت مرۆڤ باس لە شەڕ و کاولکردنەکانی ئەم دەیان ساڵەی تریش نەکات لەو وولات و ناوچەیەدا و تەنیا بۆ مێژوو دەمێننەوە. شەڕ و جەنگ وەك دیاردەیەکی مێژوویی هۆی خۆی

هەیە و ڕۆژێکیش دێت کە دەبێت کۆتایی بێت، ئەگەر مرۆڤایەتی خۆی و ئەم شارستانیەتەی ئێستەی لەناو نەبات بە هۆی زۆر فاکتەری پڕ ترسناکەوە، بەڵام هەتا ئەو کاتە بە سەدان ملیۆن مرۆڤ گیان لە دەست ئەدات لەم ڕێگایەدا...

سەدام کەسێکی درۆزن و بێ وەفاو جێگای بێ بڕواییە. تەنانەت وەفای بۆ (سەگە بە وەفاکەی خۆی نەبوو) حسێن کامل. پەیمانی لێبوردنیشی دایە و کوشتیشی. وەفای بۆ هاوڕێی منداڵی و نزیکی خۆی، وەزیری بەرگریەکەی نەبوو، عدنان خیراللە و بەو شێوە نامەردانەیە لە ناوی برد و خۆیشی لەگەڵی چوە گۆڕستان. وەفای بۆ ئەندامانی خێزانەکەی خۆی نیە، ئیتر وەفای چۆن بۆ نەتەوەی کورد، یان سەرکردایەتیەکی کورد و کەسێکی دژەکەی دەرەوەی دەبێت. ئەمڕۆکە پێت دەڵێ برامی و هەموو شتت ئەداتێ و سبەینێ دەتکوژێت و لەگەڵیشت دێتە گۆڕستان.

٢٢ ملیۆن مرۆڤی عێراقی کردۆتە کۆیلە و ئامرازی یاری و دەربڕینی ڕق و کینە و پڕکردنەوەی نوقسانیە کەسایەتیەکانی خۆی، و لە ناو ڕق و کینەی خۆیدا نوقم بوە.
سەدام لە ١٩٣٧/٤/٢٨ لە العوجە کە دەکەوێتە لای تکریت وەك منداڵی خێزانێکی جوتیار هاتۆتە دنیاوە. پێی دەڵێن سەدام حسێن التکریتی. ئەو ناوی سەدامەی درایە چونکە دایکی بۆی نەکرا وونی بکات، لە باری بەرێ و بیشارێتەوە. سبحە تلفاح بەبێ مێرد سکی بە سەدام پڕ بوو. بە واتا (زۆل) بوو. هەوڵی دابوو ئەم منداڵە زۆڵە بە ئیشی قورس و خۆ عەزیەت دان لەبار بەرێت. باوکی منداڵەکە مرد پێش ئەوەی سەدام بێتە دنیاوە. سبحە تلفاح دوایی شوی کرد بە ابراهیم الحسن و ئەم پیاوە حەزی بە چارەی ئەم منداڵە غەریبە نەدەکرد.

سەدام دەرکرایە لای خاڵی کە خیراللە تلفاحە و ئەفسەری کەرتێکی عێراقی بوو کە لە ساڵی ١٩٤١ بەشدار بوو لە ڕاپەڕینێك دژی مەلیك فەیسەڵی دووی هاشمی. خیراللە تلفاح گیرا و بۆ چەند ساڵێك خرایە بەندیخانە.
لە نێوان ١٩٣٦ و ١٩٤١ شەش هەوڵی ڕوخاندن لە عێراق تۆمار کراوە. ئەم سەدامە لاوە لە ناوەڕاستی کاتێکی فەرتەنە و پڕ ئەوژم گەورە دەبێ. دوای بەربونی گەورەی خێزانەکە لە بەندیخانە، بنەماڵەی خاڵەکەی خەریکی بازرگانی دەبن.

خەڵکی دێکە کە ئاگاداری ئەوەن کە سەدام بە زۆڵێتی لەدایك بوە کەس توخنی ناکەوێت. دەوامی قوتابخانە ناکات و خۆی دەدزێتەوە و مامۆستاکەی لە تکریت زۆر گوماتی لێ دەکات: وەك منداڵێکی تەمەن دە ساڵە زۆر حەزی لە تیرۆرو ئەشکەنجە و ئازار کردوە کە درەنگانێك گەیاندیە توکی سیستەمێکی کوژەری خەتەر. هەمیشە شیشێکی پێ بوە کە لە هاوڕێکانی قوتابخانەی پێ دادا و سەگی دێکەی لەخۆی بێ دوور خستونەتەوە و پەخش و بڵاوەی پێ کردون. لە قوتابخانە ئەم شیشەی لەژێر چەلابیەکەی شاردۆتەوە و چاروبارێش ئاسنەکەی لە ناو ئاگردا داناوە هەتا سوور هەڵگەڕاوە و دوایی بەبەر چاوی منداڵانی دەورویشتی ناوێتی بە قنگی پشیلە و سەگەوە کە دەیان گرتن.

ئەم ئاسنە شەرەف و باوك و دەسەڵاتی بوە، تەنها هاوڕێ و پارێزگاریکەری بوە لە بەرامبەر کۆمەڵگایەکی توند و ڕەق کە لەخۆیان دوردەخستەوە، چونکە باوکی مردوە و دایکی شوی کردوە بە یەکێکی تر و کەس نازانێ لە کوێ دەژی. دیارە کە سەدام ڕقی لە کۆمەڵگایە، چونکە کۆمەڵگاش ڕقیان لێیەتی و تەنها شت کە خۆی بێنوە بگرێتەوە شیشە ئاسنە سورەوکراوەکەی بوە کە بەوە ئەوانەی بە ئەشکەنجە و ئازارەوە دەکوشت کە ئەم پێی وێراون و زاڵ بوە بە سەریاندا: ئەمانەش بریتی بوون لە ئاژەڵ (سەگ و پشیلە و...). بەمەش سەرنجی

دەوروپشتەکی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە و کەموکوڕیە دەروونی و کەسایەتیەکانی خۆی بێ پڕ کردۆتەوە.

ئەوەش کە لە تەمەنی گەورەیشدا دەیکات درێژکەرەوەی ژیانی منداڵیەتی بە شێوەیەکی تر و ڕەفتارەکانی ئێستەی ڕەنگدانەوەی کات و بارودۆخی سەدامی منداڵیەتی.

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە پێویستیەکی ژیانی و کۆمەڵایەتین ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگایەکی ڕاست و دروست و سەلیم پێک بهێنین ئیهتیمام بە منداڵ بدەین و ئاگاداری شێوەی گەشەکردنیان بین و لە گشت ڕوەکانی ژیانەوە ئامادەی باشی دوا ڕۆژ بکەن. منداڵ ئەوەی دوارۆژیشە کە بڕیار لە شەڕو ئاشتی دەدات و ئاسك و حەساسە کە بە ئین وڕقەوە گەشە نەکەن و خۆشەویستیان بدرێتێ و پەروەردەی پێویست بکرێن. ئەمەش لە پەروەردەی خێزان و شێوە و سروشتی سیستەمی پەروەردەی دەوڵەتەوە دەست پێدەکات.

ئەم خاڵە یەکێکە لەوانەی کە دەمەوێت ڕونی بکەمەوە بۆ خوێنەر کە گرنگی ئەوە لە چیدایە من خۆم خستۆتە ناو قوولایی شیکردنەوەی کەسایەتی سەدام حسێن. ئەوەی ئەمڕۆکە لە عێراق ڕوو ئەدات ئاوێنەیەکە کە دەموچاوی ڕاستەقینەی کەسایەتی سەدام پێچەوانە دەکاتەوە. لێرەدا دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە کە پەیوەندی ئەم لێکۆڵینەوەیە چیە بە ئێمای کتێبەکەوە و چی بەستونی بە یەکترەوە، و ئەو پاڵەوانانەی کە لەم ڕۆمان و بەسەرهاتەدا من دەربارەیانم نوسیوە بەرهەمی ژیانی سەردەمی پێشو، و هی ئەمڕۆی عێراقی سەدام حسێنن، جا بۆیە هەموو گەشە کردنێکی قۆناغەکانی ژیانیان وەك هەموو کەسێکی تری سەردەمی خۆیان بەند بوە بەم سەردەم و واقیعەوە وەك سەرجەمی گشتی دانیشتوانی وولاتەکە. جا ئیتر ئەم پاڵەوانانەش بە باش و خراپیانەوە هەر دەبەستمەوە بەو واقعەوە کە

هەمیشەو دوبارە ویستومە بە شێوە جیاوازەکان لێرەشدا ئامازەیان بۆ بکەم.

ئایا مرۆڤ لە خۆی دەپرسێ کە بۆچی جاش و موستەشارو دل ڕەق و خائین و بەرژەوەند پەرستی دژ بە نەتەوەی کورد لە بەرەی ڕژێمی بەغدای سەدام بە گشتی زۆرتر بوە وەك لە هێزی پێشمەرگە و شۆڕشگێران و چەك بە دەستی ئازادی خوازانی کوردەوە؟ هیوادارم لە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەکانمدا لێرەدا خۆت وەلامی خۆت بدەیتەوە.

بە واتا ئەم کتێبە باس لە گێڕانەوەی فیلمێك ناکات کە کۆمەلە مرۆڤێك بە ژەهر خوارد کردن چۆن چۆنی گیانیان لە دەست داوە و وەك ڕۆمانێك بێتە بەرچاو. بەلێ مەبەستێکی سەرەکی گرنگیشم لە پاڵ بە بەڵگەنامەی ڕوداوەکە کە تەعبیر لە کۆمەڵە ڕەفتاری دڕندەیەکی بە ناو مرۆڤەوە دەکات، لە هەمان کاتیشدا دەمەوێت ببێتە جێگای دانوستاندن و وتووێژ لە ڕووی کۆمەلایەتی و سایسی و ئابوری و دەروونی و یاسایشەوە. بە واتا بۆ کۆمەڵناس و دەروونناس و سیاسەتمەدار، و هەروەها بۆ یاسا ناس و ئابوری ناسەکانیش ببێتە پرۆژەی لێکۆلینەوەیەکی زانستانە و بابەتیانە.

لە ساڵی ١٩٥٥ خالی دەگوێزێتەوە بۆ بەغدا و سەدامیش لێرە دەچێتە قوتابخانەی الكرخ و لە ناوچەی تەکاریتە گەورە دەبێ. ژمارەیەکی زۆری بنەماڵەی تکریت سەرچاوەی ژیانیان بە دزی و جەردەیی سەرجادەکان پەیدا کردوە و بە شێوەی مافیا کۆمەڵگای بەغدایان داگیر دەکرد. بنەماڵەی تکریت وورده وورده دەسەلات پەیدا دەکەن و گیروگرفت و ڕوداوی بنەماڵە بە خوێن ڕشتن چارەسەر دەکەن.

یەکەم پیاو کوشتنی سەدام لێرەدا دەبێت. بە فەرمانی خالی چەتەیەکی ناکۆکی خۆیان مامێکی دوری خۆی سەعدی ڕەممی دەکات و دەیکوژێت. بەمە پەیوەندی تەسك و نزیك بە بنەماڵەی تکریتەوە دوپات

دەکاتەوە. هەنگاوێکی یەکەم کە بوونی خۆی بە تیرۆر و زەبروزەنگی بێ بەزەیی و دڵ ڕەقانە تەئمین دەکات.... هتد.
سەدام باش دەزانێت کە ئەو، و دیموکراتیەت دوو شتی زۆر جیاوازن. زۆر باش دەزانێت کە بوونی دیموکراتیەت بە واتای نەمان و لە ناوچوونی ئەو و کۆتایی هێنانە بە ڕژێم و بنەماڵەو داروودەستەکەی. لەبەر ئەم هۆیە ناچارە کە تەنیا بە زەبروزەنگ و تیرۆر و سیاسەتی داپڵۆسین بتوانێت لەسەر دەسەڵات بمێنێتەوە. داروودەستەکانیشی هەروەها باش دەزانن کە چارەنوسیان بەستراوە بە چارەنوسی سەدام حسێن و ڕژێمەکەوە.

لەبەر ئەوە دەبێت بۆ هەموو کەس و لایەنێك ئاشکرا بێت کە لە لایەن ئەمانەوە ماف نادرێت، بەڵکو دەبێت بە خەباتی سەخت و دوورودرێژ خایەن بسەندرێت بە هیوای ئەوەی کە ئیتر لەم وولاتە بۆ هەمیشە کۆتایی بە شەڕ و ئەنجامەکانی بهێندرێت. بۆ ئەم مەبەستەش یەکگرتن بۆ ئێمە و دوور کەوتنەوە لە خیانەت و گوێنەدان بە چارەنوس مەرجێکی گرنگە، و سروشتی بزوتنەوەکەش دەبێت لەسەر بناغەی دادپەروەری و دیموکراتی دارێژرابێت کە شوێن بە دیکتاتۆریەت لێژ بکات و مێژویەکی نوێی شارستانیەت بۆ مرۆڤەکانی ئەم وولاتە پێك بهێنێت، گەر نا ئەو کاتە تەنیا بریتی دەبێت لە گۆڕانی ڕەنگ و شێوەی دەرەکی و هیچی تر.

لە عێراق هەرچەندە (ئەنجومەنی نیشتمانی) یەك هەیە، بەڵام دەسەڵات بە دەست (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش - مجلس قیادە الثورە) یە کە صدام سەرۆکایەتی دەکات و هەموو بڕیارو یاسایەك دەبێت بە ژێر دەستی ئەمدا بڕوات. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە (مجلس العائلی) خێزانی سەدام هەیە کە هەموو بڕیارێك لە ڕاستیدا لێرەوە دەدرێت. تەنانەت حیزب هەر دەمێکە ڕۆڵی نەماوە.

سەدام بە بیروڕای من نەك هەر خەتەرە بۆ گەلانی عێراق بەڵکو خەتەرە بۆ مرۆڤایەتی و نەخۆشی کوشتن و لە ناو بردنی هەیە. کەسێك و کوڕەکانی بە دەستی خودی خۆیان بە سەدان مرۆڤی بێ تاوانیان کوشتبێت و دزی و چەردەیی بکەن ئیتر ئەبێت ج سیستەمێکی پەروەردە و ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی لەمانەوە چاوەڕوان بکرێت. کە بەم هۆیەوە دیاردەی خراپ لە ناو کۆمەڵانی خەڵکی ئەو وولاتەدا دروست بوە.

گۆڤاری هەفتانەی بەناوبانگی ئەڵمانی شپیگل لە ژمارەی ۳۲/ سالی ۱۹۹۰ دەنوسێ: شارەزایەکی ئیسرائیلی بۆ لێکۆڵینەوە لە نوسینی دەستوخەتی مرۆڤ، دەربارەی نامەیەکی دەستبی سەدام حسێن، بێ ئەوەی پێشتر بزانێت نوسینی کێیە تەقیمێکی زانستانەو دەرونیانە بەم شێوەیە دەربارەی دەکات:

" ئەم مرۆڤە کەوتۆتە ژێر میزاجێکی زۆر بەرزو نزمەوە و نەفسیەت و کەسایەتی چەسپیو نیە. ئامادەیە زۆر بڕیاری قورس بدات و بە جێشی بهێنێت. حەزی زۆر لە زەبروزەنگە و خەتەرە بۆ کۆمەڵگا. پێویستە زۆر بە زوبی لە کۆمەڵگا دوور بخرێتەوە و بنێردرێتە شوێنی چارەسەر کردنەوە.

- شەڕی کورد و وێران کردنی کوردستان، بەکار هێنانی چەکی کیمیاو ئەنفال کردنی کورد، شەڕی شیعە و وێران کردن و وشك کردنی هۆرەکانی خوارووی عێراق، و هەشت سال شەڕی وولاتێکی ئیسلامیی وەك ئێران کرد و دوایش خۆشی لە شەڕی دوەمی کەنداودا ئالای شەڕی پیرۆز هەڵدەگرێت و الله و الاکبر دەخاتە سەر ئالای عێراق. مەبەستی سەدام بە عەرەب کردنی ئیسلامە نەك بە ئیسلام کردنی عەرەب.

داگیر کردنی کوێت و دزی و تالانی و دەست درێژ کردن بۆ ناموسی دانیشتوانی و هەڕەشە کردن لە هاوسێکانی عێراق و بازرگانی کردن بە کێشەی فەلەستینەوە.

پڕکردنــی بەندیخانــەکان لــە بــەند و ئەشــکەنجە و ئــازاردان و لــە سێدارەدانی هەزاران مرۆڤ. کوشتن بە ژەهری سالیۆم و تواندنـەوەی مرۆڤ لە حەمامی تێزاب دا. بێ سەروشوێن کردنی هەزاران هاوولاتی بێ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بتوانرێت بدۆزرێتەوە، و کردنی عێراق بە بەندیخانەیەکی گەورە.

دروست کردنی چەکی کیمیاوی و بایۆلۆجی و بە کارهێنانی و هەوڵی دروست کردنی چـەکی ئـەتۆمی. دەبێت مـرۆڤ بێناسـەی کەسـێك یـان ڕژێمێك چۆن بکات کە بتوانێت لـە دەوڵەتەکەی خۆیدا و بەرامبەر بـە "گەلەکـەی خـۆی" گـازی ژەهـراوی بکـات بەسـەر هـەزاران منـداڵ و ئافرەت و پیر و مرۆڤی بێگوناه کە توانـای بەرگری کردنیـان لـە خـۆ نەبێت.
لە کوێرەوەری و ماڵوێرانی و کاول کردن و شەڕ و کارەسـات زیـاتر سەدام حسێن و داروودەستەو بنەماڵە بـەدناوەکی چـی تریـان لـەم ٣٠ ساڵەی فەرمانڕەواییان دا بۆ عێراق بە دەست هێنـاوە. بەڕێوە بردنی وولات و سیاسەت کردن چۆن بەم جۆرە دەبێت. لە مێژووی ئەم ٣٢ ساڵەیدا لە هەموو سیاسەت و شەڕو پڕۆژەکانیدا ژێرکەوتوو بوە، وە لە زیـان بـە گـەلانی عێـراق و ناوچەکـە زیـاتر هیچـی تـری بەدەست نەهێناوە. سیاسەت و ڕەفتاری بە خزمەتی تەواوی حکومەتی ئەمریکی و ئینگلیزو بازرگانانی چەك و زلهێزەکان... کۆتایی هاتوە.

ئـەو باسـەی سـەرەوە تـەنیا چـەند نمونەیــەکی بچـووك بــوون بــۆ ڕونکردنـەوەی ئـەو ڕاستیەی کـە سـەدام چـەندە ئەخۆشـیی بـە کۆمـەڵ کوشتن و داگیر کردن و دەسەڵاتی هەیە، و چەندە بێ وەفایە تەنانـەت بۆ هاوڕێکانی خۆیشی و ئەوانەش کە ساڵانێکی دوورودرێژ هاوخـەباتی بوون.
بۆیـە دوبـارە دەڵێم بـا دەست لەناو دەست تێبکۆشین بۆ کۆمەڵگایـەکی مــەدەنی و دادپــەروەر و دور لــە ڕق و کینــە، بــۆ ژیـانی ئاشـتی و بەشداری لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو دوانەکەوتن لە شارستانیەت.

(١٥)

## دوا ووشه

وەك دوا ووشه دەڵێم:
١) هەروەك شاعیری کۆچ کردوی بە ناو بانگی ئەڵمانی بێرتۆلد برێشت دەڵێ: "پێش ئەوەی مرۆڤ بیەوێ کۆمەڵگا بگۆڕێت، پێویستە پێشەکی خۆی بگۆڕێت". وە هەروەها ناچارم کە بە وتەیەکی تری کۆتایی بەم بەشە بهێنم کە دەڵێت: " ئەو مرۆڤەی کە خەبات دەکات و تێدەکۆشێت لەوانەیە بدۆڕێت، بەڵام ئەوەی کە خەبات ناکات ئەوە هەر دەمێکە دۆڕاوە".

٢) ئەو کەسەی کە وا بزانێت دەتوانێت لە ماڵەوە دابنیشێت و بێ هەوڵ و خەبات هەموو شت لە خۆیەوە دەگۆڕێت بە هەڵەدا چوە. مەرجیش نیە مرۆڤ بە قۆناغێك و بە دوان بگاتە ئامانجێکی تایبەت. لەوانەیشە تێیدا بدۆڕێ و توشی نەهامەتی و زیان و تێداچونیش ببێت، بەڵام کات و سەردەم دێت و دەڕوات و ئەوەی نوێ پێدەگات و مرۆڤ بە تەجروبەی خۆی و مێژوو دەڕوات و ئەوەندەش چەوساندنەوە و ماف خواردن هەبێت ئەوەندەش یاسای سروشتە کە مرۆڤ دەست هەڵناگرێ لە شەڕ و تێکۆشان بۆ ژیانێکی باشتر و هیچ کەس هەتا سەر کۆت و زنجیری کۆیلایەتی قبول نیە.

٣) بە کوشتنی ئەرمین حەوێز ،کێشە و دیاردە کۆمەڵایەتیە گشتیەکان چارەسەر نابن. ئەگەر یتەوێت نمونەی وەك ئەوانە بگۆڕیت و ئەو دیاردانە ڕوو نەدەنەوە دەبێت ئەو کۆمەڵگایە بگۆڕیت.

٤) بۆ من وەك خەونێك وایە كە لە كوردستانێك كەسێك لەبەر بەیانێك دژ بە ڕژێم لە سێدارە دەدرا، یان كەسێك لە حەمامی تێزابدا توێنراوەتەوە هەر لەبەر ئەوەی قاچی بە پۆستەرێكی خوساوی جەنابی سەدام حسێن دا ناوە، ئێستە من بە ئازادی بتوانم بگەڕێمەوە بەشێكی ئەم وڵاتە و لە ناو دڵی شاری هەڵەبجە و قوربانی سلێمانیدا كتێب و نوسراوە دژ بەم ڕژێمە بە كۆمەڵ كوژە لە چاپ بدەم و بیروفكری زانستانە و ئاشتیخوازانە بڵاو بكەمەوە... بەڵێ خەونیش دەكرێ بێتە دی، و مرۆڤ پێویستە بڕوای بە چنینەوەی خەباتی خۆی بێت، وە لەوانەیە لە ناوەڕاست گەشتی ژیانیدا خۆی لە ناوەڕاستی دارستانێكی تاریكدا ببینێتەوە ئەگەر ڕێگای ڕاستی وون بكات. دەبا دەست لە ناو دەست قەلای زولم و زۆرداری بڕوخێنین.

(١٦)

## بورکانی بیروباوەڕی چەوساوەکان بەندیخانە و کۆشکی زۆردار دەڕوخێنێ.

بورکانی بیروباوەڕی چەوساوەکان بەندیخانەو کۆشکی زۆردار دەڕوخێنێ، شەوی ژان و چەوساندنەوە دەسوتێنێ. ئێمەین دڵدارانی هەتاو، سوپای گەلی زۆرلێکراو، ئێمەین دڵدارانی هەتاو سوپای گەلی زۆر لێکراو. هاوڕێی ڕێگای ڕزگار بوون و ڕۆژی تازەین بۆ کوردستان، بۆ کوردستان.

هیوای ڕەنجدەرانی خاکی زامدمان پێیە، ئالای بەرەی برایەتی و ژیانمان پێیە، موژدەی وەرزی خۆشەویستی و نانمان پێیە. ئێمەین دڵدارانی هەتاو، سوپای گەلی زۆرلێکراو.
هاوڕێی ڕێگای ڕزگار بوون و ڕۆژی تازەین بۆ کوردستان، بۆ کوردستان.

ئالای دەستمان بە خوێنی هاوڕێیان سوورە، دەڕۆین دەڕۆین گەرچی ڕێگای شۆڕش یەکجار دوورە، گەرچی ڕێگا داوە و تەلبەندە و سنورە. ئێمەین دڵدارانی هەتاو سوپای گەلی زۆرلێکراو. هاوڕێی ڕێگای ڕزگار بوون و ڕۆژی تازەین بۆ کوردستان بۆ کوردستان، بۆ کوردستان، بۆ کوردستان.

ئەی هاوڕێیان، ئەی هاوڕێیان قارەمانان ئێوەن پێشەنگی کاروانی ڕێگای تێکۆشان. دەی هاوارتان دەست و چەکتان با گوێ کەڕ کات، با گوێ کەڕ کاو بلەرزێنێ دوژمنانتان.
بە ڕابەری برۆلیتار دەست لە دەستی ڕۆڵەی جوتیار، بە خەباتی هەموو چین و توێژی کۆمەڵ هەنگاو دەنێین بۆ پێشەوە بۆ ڕزگاری بۆ نەمانی جەور و ستەم بە یەکجاری بۆ ڕزگاری کوردستانم بۆ

سەندنەوەی مافی تێکڕای ڕەنجدەرانم، بۆ ئازادی و سەرفرازی بۆ سۆشیالیزم، بۆ هەموو کەس ڕۆژی شادی.

سڵ لە دوژمن ناکەینەوە بەری ڕەنجمان دەچنینەوە. وەك چۆن وایە شەو بڕوا ڕۆژ هەر هەڵدێت، ئاواش دەزانم ڕزگاری بۆمان دەبێت. بە ڕۆژی باو بەفرو تۆفان، بە بێخاوس، بە بێخاوس بە برسێتی کۆلی گران، بە باوەڕی پۆلاینمان دەبڕین دەبڕین دەشت و دۆل و لوتکەی گشت چیاکان. ئێمەی باوەڕ بە کارگەران، بە زە حمەتکێش بە هەزاران.
ئەوەی تەنیا لە کیسمان چێت لەم ژیانە تەنیا بەند و زنجیر و کۆتی گرانە.
ئەی هاوڕێیان قارەمانان ئێوەن پێشەنگی کاروانی ڕێگای تێکۆشان

*** تەواو بۆ چاپی یەکەم ***

# ژیاننامەیەکی کورتی نووسەر

نوسەر لە شاری سلێمانی هاتوتە دنیاوە، و لە ساڵی ١٩٧٦ نیشتمانی جێهێشتوە و لە ئەڵمانیای فیدەراڵی جێگیر بوە. هەر لەم وڵاتە بە ڕێگای خارجی خوێندنی ناوەندی تەواو دەکات و دواجار لە قوتابخانەی شەو لە شاری بۆن ی پایتەختی ئەوکاتەی ئەڵمانیا خوێندنی ئیعدادیە تەواو دەکات کە لەم وولاتە بریتیە لە ٧ی ئیعدادی. بەواتا خوێندن بریتیە لە ١٣ ساڵ.

لە ساڵی ١٩٩٢ لە زانکۆی ماربورگ کۆلێژی بەشی زانستی سیاسە و ڕۆژنامەوانی و کۆمەڵایەتی تەواو دەکات. هەر لە کاتی خوێندنی زانکۆیدا گەشتێکی لێکۆڵینەوەی چەند مانگی بۆ ئەمریکای لاتین دەکات، کە چەقی لێکۆلینەوەکەی وولاتی نیکاراگوا دەبێت و دەنگی نەتەوەکەی گەیاندوە بە بەشەکانی ڕاگەیاندی ئەم وولات و ناوچەیە. لە کوردستان لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێی چاپی سلێمانی کە خۆی ئەندامی دەستەی نوسەرانیەتی، بە پێنج زنجیرە باسی گەشتەکەی ئەمریکای لاتینی دەکات، و هەروەها لە ٢٠٠٠/٧ لە میدیا تیڤی بە چوار زنجیرە بە وێنەوە لە بەرنامەی زانینگەی مەد پەخشی کردوە و باسەکە دەبێتە کتێبێك بە زمانی کوردی.

ئەم خێزانە کە هەموو ژیانیان لە عێراق دەبەنە سەر لە لایەن ڕژێمەکانی یەك لە دوای یەکی عێراقدا ڕەفتاری بێگانەیان لەگەڵدا دەکرێ، و بێ ماقی شوناسنامە لە لایەن ڕژێمی سەدام حسێنەوە ماڵ و موڵکیان داگیر دەکرێ و لە وولاتی دێرینی خۆیان دەر دەردەکرێن بۆ ئێران و لێرە توشی ژیانی ئوردوگا و

ناخۆشی تراژیدیا دەبن و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە شاری مەهاباد دایکیان بە ڕوداوێك کۆچی دوایی دەکات و هەر لەم شارە خۆشەویستەی ڕۆژهەلاتی کوردستان بە خاك دەسپێردرێ. ئەمڕۆکە گشت کەسوکاری نوسەر لە چەند دەولّەتێکی ئەوروپا پەرش و بڵاو بونەتەوە و گیرساونەتەوە.

بابەتی نامەی دوکتۆرای نوسەر بریتیە لە: "عێراق و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی لە عێراق لە سەرەتای جەنگی دوەمی کەنداوەوە هەتا ئەمڕۆ،و پەیوەندی بە ناوچە و سیاسەتی نێو دەولّەتیەوە".

ئەندامی دەستەی نوسەرانی گۆڤاری "کوردستانی ئەمڕۆ"یە کە بە زمانی ئەڵمانی دەردەچێت کە کاتیی لەبەر هۆی مالی بڵاوکردنەوەی ڕاوەستاوە، و هەروەها ئەندامی دەستەی نوسەرانی کوردستانی نوێی چاپی سلێمانیە. خاوەنی کۆمەڵێك لە بڵاوکراوە و نوسراوە و وتوویژ و وەرگێڕاوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بە هەردوو زمانی کوردی و ئەڵمانی کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لێی:

١) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ وەزیری پێشمەرگایەتی و ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، کاك جەبار فەرمان ( بە هەردوو زمانی کوردی و ئەڵمانی بڵاو کراوەتەوە
٢) چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی (Oberhessische Presse)ی ئەڵمانی لەگەڵ شاعیر و وەزیری ڕۆشنبیری پێشوی حکومەتی هەرێمی کوردستان کاك شێرکۆ بێکەس
٣) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و

ئەندامی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك) کاك کۆسرەت ڕەسول علی بۆ ڕۆژنامەی سەکۆ

٤) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سکرتێری حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان کاك محەمەدی حاجی مە حمود/ ئابی ١٩٩٧ لە ئەڵمانیا و کردنی بە نامیلکەیەکی ٣٠ لاپەڕە.

٥) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەرکردەی لەشکری شانزەی (ی.ن.ك) کاك ئاسۆ مەمەند (ئاسۆ ئەڵمانی) سەبارەت بە داگیر کردنەکەی شاری هەولێر لە ٩٦/٨/٣١ بۆ ڕۆژنامەی سەکۆ لە بەرلین.

٦) وەرگێڕانی دیدەنی گۆڤاری هەفتانەی ئەڵمانی (Stern) لەگەڵ د. ئە حمەد چەلەبی لە لەندەن.

٧) وەرگێڕانی دیدەنی گۆڤاری هەفتانەی ئەڵمانی (Spiegel) لەگەڵ بەڕێوەبەری موخابەراتی پێشوی عێراقی وفیق سامرائی.

٨) کوردستان، بێ دەنگ بوون دەکوژێ! ئاشتی ئێستاکە. سێیەمین کۆنگرەی پارتی سەوزەکانی ئەڵمانیا. بڕیاری کۆنفرانس سەبارەت بە کوردستان. بلاو کردنەوەی بە دوو زنجیرە لە کوردستانی نوێ.

٩) وتووێژ و بیروڕا دەربڕینێکی یەك ڕۆژە (لەسەر بانگ کردنی کۆمیتەی هاوکاری کوردستان/ کورد و ئەڵمان) لە لایەن (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) لە ئەڵمانیا سەبارەت بە پێکدادانە چەکدارییەکەی نێوانیان لە شاری هایدلبێرگ/ ئەڵمانیا

١٠) گەیاندنی هەواڵنامەیەکی بە پەلەی (medico intern[illegible]onal) سەبارەت بە داگیرکردنەکەی شاری هەولێر لە لایەن سوپای ڕژێمی عێراقەوە بە پاڵپشتی پ.د.ك لە کاتی کارەساتەکە...

١١) پالەپەستۆ بۆ گرتنە دەسەڵات لە کوردستانی "عێراق"

١٢) تورکیای ئەندامی هاوپەیمانی ئەتلەسی چەکی کیمیاوی لە دژی گەریلا بەکار دەهێنێت.

١٣) لە یادی دە ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر ترازیدیاکەی هەڵەبجەدا (هیرۆشیمای کوردستان) لە کوردستانی نوێ/ سلێمانی.

١٤) لەشکرکێشیەکانی دەوڵەتی تورك بۆ خواروی کوردستان لە سەرەتای هەشتاکانەوە هەتا ١٩٩٨ و ڕۆل و هەڵوێستی کورد و زلهێزەکان. بە پێنج زنجیرە لە ڕۆژنامەی مانگنامەی بێوار لە هۆڵەندە، وە کورتەیەکی لە ڕۆژنامەی سەکۆ و ژوان لە ئەڵمانیا بڵاو کراوەتەوە. وە بە زمانی ئەڵمانیش لە گۆڤاری مێدیکۆ ئینتەرناشنال بە سێ ونجیرە بڵاو کراوەتەوە.
١٥) ڕژێم تووشی هەڕەشەی ڕاپەڕینی بەشە سونیەکەی عێراقیش هات
١٦) چارەسەری کێشەی کورد لە تورکیا گفتوگۆو لێدوانە (مام جەلال لە دیدەنیەکدا لەگەڵ گۆڤارێکی ئەڵمانی
١٧) گەلێك بە خشکەیی لەناو دەبرێت
١٨) کێشەی سیاسی کورد لە کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتیدا
١٩) خوێندنی مەسەلەی کورد لە زانکۆی ماربورگ - ئەڵمانیا. نوسەر لەگەڵ پرۆفیسۆر K. REHBEIN بە هاوبەش لە کۆلێژی بەشی پەروەردە وانەیەکی شەش مانگیان پێشکەش کرد سەبارەت بە کێشەی کورد، کە بۆ یەکەم جار بوو بە بەرەسمی چوە ناو کتێبی خوێندنی زانکۆوە.
٢٠) لە یادی پێنج ساڵەی تیرۆر کردنی ڕۆژنامەوانی ئەڵمانی لە باشوری کوردستان خاتوو لیسی شمیث لە کوردستانی نوێی سلێمانی بە دوو زنجیرە.
٢١) مرۆڤایەتی قەرزاری منداڵە
٢٢) گەشتی ڕۆژنامەوانێکی کورد بە ئەمریکای لاتینیدا بە چەند زنجیرەیەك لە ڕۆژنامەی مانگنامەی بێوار / هۆلەندە.
٢٣) لە یادی دوو هەزارەمەمین ژمارەی کوردستانی نوێ، لە ژمارە بیست - ٢٣ لە کوردستانی نوێ - سلێمانی لە مانگی ٩-١٢/١٩٩٩
٢٤) ڕقم لە ژیانە (ئاڵای ئازادی - ١١/١٩٩٩- سلێمانی)

## چەند بەرهەمێکی تری نووسەر لە کتێب و نامیلکە...

٢٥) ڕوخاندنی نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق لە ئەڵمانیای فیدەرالی و لێکۆڵینەوەیەك - سیاسەت و ڕۆڵی پارتی و بنەماڵەی بارزانی. (نامیلکەیەکی ٨٠ لاپەڕە بە زمانی کوردی. (پ.د.ك) بە ١٠ لاپەڕە وەڵامی داوەتەوە). کاك برایم جەلال لە کوردستانی نوێ/ لەندەن لە ٧/ ٢٠٠٠ وەلامی (پ.د.ك) ی داوەتەوە.

٢٦) چاپی دوەمی کتێبی "من کوڕی سەدام بووم"، ٣٠٠ لاپەڕە بە زمانی کوردی بە وێنە و نەخشەوە لە سلێمانی، و لە ئەڵمانیا.

٢٧) نامیلکەیەك لە ژێر ناونیشانی "ڕفاندنی سەرۆکی گشتی پارتی کرێکارانی کوردستان عبداللە ئۆجەلان لە کینیاوە بۆ تورکیا". کورتەیەکی بە دوو زنجیرە لە ڕۆژنامەی بێوار (هۆڵەندا) و کوردستان (بەرلین) بڵاو کراوەتەوە

٢٨) کوشتن لە عێراق بە ژەهری سالیۆم و تراژیدیاکەی ناوچەی سێڕوان لە مەرگە و لێکۆلینەوەیەك (کتێب بە وێنە و نەخشەوە). لێکۆلینەوەکان لە ئەوروپا و لە کوردستان بە ئەنجام گەیەندراوە. ١٦٠ لاپەڕە.

٢٩) گەشتێکی لێکۆلینەوەی چەند مانگی بۆ ئەمریکای ناوەراست. نیکاراگوا وەك جەقی لێکۆڵینەوەکە. کردنی چەند سیمینارێك سەبارەت بەم گەشتە و لە ئایندەدا کردنی بە کتێبێك بە زمانی کوردی بە وێنە و نەخشەوە.

٣٠) کوشتن لە عێراق بە ژەهری سالیۆم و تراژیدیاکەی ناوچەی مەرگە لە کوردستان.

# وتووێژی تەلەفزیۆن

بەشدار بوونی نوسەر چەند جارێك لە وتووێژی تەلەفزیۆنی مەد (MED TV)، کە دواجار بوە MEDYA TV کە زۆربەیان پەخشی ڕاستەوخۆ بوون و هەروەها لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کە چەند بابەتێکی بریتین لە:

ا. " کۆچ و ڕەوی کورد بۆ هەندەران. پانێل.
ب. لە یادی دە ساڵەی تراژیدیای کیمیابارانەکەی هەڵەبجە.
ج. ڕێککەوتنەکەی ۹۸/۹/۱۷ ی واشنتن و سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە کوردستانی "عێراق" و ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی".
د. وتووێژێك بە نیشاندانی وێنەی ڤیدیۆوە سەبارەت بە گەشتێکی نوسەر بۆ خواروی کوردستان لە مانگی ۲۰۰۰/۱۱.
هـ. بەرنامەیەکی ٤٥ خولەکی ڕێپۆرتاژ سەبارەت بە ئەنفال کە نوسەر لە گەرمیان لە هەمان بەرواری سەرەوە بە ئەنجامی گەیاندوە.
ن. پێشکەش کردنی گەشتەکەی ئەمریکای لاتین بە چوار زنجیر هەر لە تەلەفزیۆنی میدیا لە بروکسل لە بەرنامەی زانینگەی مەد لە مانگی ٦ /۷-۲۰۰۰
و. وتووێژێك لەگەڵ تەلەفزیۆنی دەنگی گەلی کوردستان (ی.ن.ك) لە ۱۹۹۲/۷ سەبارەت بە چالاکیەکانی هاووڵاتیانی کورد لە هەندەران و هەست و دیدەی من وەك هاووڵاتیەکی کورد دوای ۱۷ ساڵ لە ژیانی ئاوارەیی گەڕانەوەی بۆ کوردستانی ئازاد، و چەند بابەتێکی تری ڕۆژنامەگەری... هتد.
ع. وتوێژێك لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان لە مانگی ۲۰۰۰/۹

٣١) شەهید کردنی دۆستی بەوەفای کورد ڕۆژنامەنوسی ئەڵمانی خاتوو لیسی شمیت لە کوردستانی "عێراق" بە دەستی جاسوس و مرۆڤ کوژەکانی ڕژێمی بەغدا (بە زمانی ئەڵمانی لە گۆڤاری کوردستان هۆیتە)

٣٢) عێراق پێش و دوای شەڕی کەنداو. وەڵامدانەوەی بابەتی عێراقیەکی سەر بە ڕژێمی بەغدا بە ناونیشانی "بەغداد دوای جەنگەکە" لە گۆڤاری (Grun- Bunt-Alternative Liste) بە زمانی ئەڵمانی ، ١٩٩١

٣٣) کورد و سیاسەتی نێودەوڵەتی بە دوو زنجیرە لە گۆڤاری (Horizonte) بە زمانی ئەڵمانی، ژمارە ١+٢ لە سەرەتای ١٩٩٠.

٣٤) وتووێژێکی نوسەر لەگەڵ ڕۆژنامەی (Barricada) ی بەرەی ساندینستەکان لە ماناگوا/ نیکاراگوا لە گەشتێکی دراسی بۆ ئەمریکای لاتینی لە ١٩٨٨/١١ بە زمانی ئیسپانی

٣٥) کوردستان و کورد. مێژوو دایەش بوون، بە زمانی ئەڵمانی لە گۆڤاری (Virus Marburg) ژمارە ٢٣، مانگی ١٩٩٢/٤

٣٦) ڕاپۆرتی گەشتێك سەبارەت بە کوردستانی عێراق لە گۆڤاری هەفتانەی ئەڵمانی (Express) لە مانگی ١٩٩٢/٦

٣٧) بابەتێك سەبارەت بە کتێبی "من کوڕی سەدام بووم" لە گۆڤاری کوردستان هۆیتە.

٣٨) وتووێژ لەگەڵ دوو پەناهەندەی کوردستانی عێراق سەبارەت بە هۆکان و ئەنجامەکانی کۆچ و ڕەو کردن بۆ هەندەران

٣٩) لەشکرکێشیەکانی دەوڵەتی تورك بۆ خواروی کوردستان (سەروی عێراق) لە سەرەتای هەشتاکانەوە هەتا ١٩٩٨، و ڕۆڵ و هەڵوێستی کورد و زلهێزەکان.
کورتەیەکی بە زمانی ئەڵمانی لە گۆڤاری (کوردستان

ئەکتوئێل - Kurdistan
aktuell) ی مێدیکۆ ئینتەرنەشنال بە دوو زنجیرە، وە
هەروەها لە گۆڤاری (کوردستان هۆیتە) بڵاو کراوەتەوە
٤٠) وتووێژێکی ڤیدیۆ لەگەڵ (تۆکسیکۆلۆج) پرۆفیسۆر
هێندریکس ئاوبین. یەکەم وەفد بوو کە لە لایەن UN وە
نێردرا بۆ هەڵەبجە بۆ لێکۆلینەوە لە کارەساتەکە
٤١) وتووێژێك لە چوارچێوەی کۆنفەرەنسێکی
نێودەوڵەتی لە شاری برێمن - ئەڵمانیا لەگەڵ ئەندامی
پەرلەمانتی ئەڵمانیا خاتوو پێترا کێلی و هاوسەرەکەی
جەنەرال سێیاستیان کە پێی دەوترا جەنەرالی ئاشتی و
وازی لە سوپای ئەڵمان هێنا (پارتی سەوزەکانی ئەڵمانیا).
بە ماوەیەکی کورت پێش کوشتنەکەی سەبارەت بە کێشەی
کورد و فرۆشتنی چەکی کیمیاوی لە لایەن کارگەکانی
ئەڵمانیا بە عێراق بە ئاگاداری حکومەتی ئەڵمان،
وەڵوێستی هاوبەیمانی ئەتلەسی سەبارەت بە کێشەی
کورد. ئەم ئافرەتە

# amnesty international news release

INTERNATIONAL SECRETARIAT
1 Easton Street London WC1X 8DJ
United Kingdom

AI Index: MDE 14/01/88
Distr: SC/PO

INTERNATIONAL EMBARGO يحظر نشره قبل الساعة ٠٠:٠١ بتوقيت غرينيتش من منتصف ليل الأربعاء في ١٣ كانون الثاني/يناير ١٩٨٨

## منظمة العفو الدولية تطلب من الحكومة العراقية التحقيق في تقارير استخدام الثاليوم لتسميم معارضيها السياسيين

أصدرت منظمة العفو الدولية اليوم ( الأربعاء في ١٣ كانون الثاني/يناير ١٩٨٨ ) بيانا طلبت فيه من الحكومة العراقية إجراء تحقيق في تقارير وردت حول استخدام قوات الأمن العراقية لمادة الثاليوم السامة للتخلّص من المعارضين السياسيين للحكومة.

والجدير بالذكر ان الثاليوم هو عنصر فلزي ثقيل يُستخدم عادة كسم للفئران.

وجاء في بيان منظمة حقوق الانسان العالمية الانتشار انها تلقّت تقارير حول تسميم ما لا يقلّ عن ٥٠ كرديا من المعارضين للحكومة العراقية ، في حوادث منفصلة وقعت خلال العام المنصرم وتوفي فيها ثلاث من الضحايا خلال ساعات من تسميمهم . وقد نُقل ثلاثة آخرون من المصابين الى انجلترا قبل عيد الميلاد بقليل لحاجتهم الى العلاج الطارئ . ولا يزال واحد منهم في المستشفى، بينما يتماثل الآخران للشفاء.

وأضافت المنظمة ان الطبيب الذي عالج الأكراد في لندن أفاد ان إصاباتهم كانت خطرة، نتيجة "تسمّم حاد بمادة الثاليوم في ٢٤ تشرين الثاني/نوفمبر ١٩٨٧".

وقالت المنظمة انها كانت قد استلمت تقارير أفادت ان عشرة أكراد تتراوح أعمارهم بين الرابعة عشرة والستين جرى تسميمهم بمادة الثاليوم في ذلك التاريخ في بلدة ... بمحافظة السليمانية ، شمالي العراق. وقيل ان السم وُضع من قبل عميلة لقوات الأمن العراقية في شراب لبن قُدّم لهم في منزل أحد أعضاء الاتحاد الوطني الكردستاني.

وكان بين الضحايا أعضاء في الاتحاد الوطني الكردستاني، وفي الحزب الاشتراكي الكردستاني - العراق، وكلا الحزبين مشتبكان في صراع مسلّح مع قوات الحكومة.

وقد توفي ثلاث من الضحايا خلال عشر ساعات من تناول اللبن المسمّم ، بينما عانى الستة الآخرون من أعراض متنوعة مرتبطة بالتسمّم بمادة الثاليوم، كالتقيّؤ ، والحمّى ، والاضطرابات العصبية ، وتساقط شعر الرأس.

ونُقل المصابون الى أحد مستشفيات طهران . لكن أكثرهم خطورة نُقلوا في وقت لاحق الى لندن ، وذلك لعدم توفّر ترياق أزرق بروسيا ( بروسيانيد الحديد ...) المضاد لسم الثاليوم في طهران . ورغم ان هذا الترياق قد أُرسل الآن الى طهران ، تتّخذ الآن ترتيبات لنقل مصابين آخرين الى لندن لتلقّي المزيد من العلاج.

①

G N Volans BSc MD FRCP
Director
J A Henry MB MRCP
Consultant Physician
V S G Murray MSc MB ChB
Hon Consultant Occupational Toxicologist
B Widdop BSc PhD
Consultant Biochemist

**Lewisham and North Southwark Health Authority**

# Poisons Unit

New Cross Hospital
Avonley Road London SE14 5ER
Telephone 01 407 7600

CASE SUMMARY

MUSTAFA MAHMOUD, AGED 41

DIAGNOSIS Thallium poisoning

Mr Mahmoud was admitted to London Bridge Hospital on December 21 1987, following thallium ingestion on at least two occasions. He developed chest pain after suspected poisoning with thallium on October 5 1987, but had no other symptoms. On another occasion on November 24, twelve people dined in a private house in Marga. Three of these people (including his mother, aged 65) died. One male had vomiting, cold sweating, lost vision and died within 3 hours. One female collapsed after 2 hours, vomited repeatedly and died four hours after the meal. His mother also had repeated vomiting and died after ten hours. None of the other people developed symptoms that day, but within 24-48 hours several people had numbness in the feet and hands, pains in the legs and difficulty in walking. Mr Mahmoud had stomach pains and severe vomiting, lost sensation in his toes and fingers and developed difficulty in breathing. Thallium poisoning was diagnosed and they were transferred to Tehran for treatment. This involved a six day journey by mule, so that no treatment was given for several days.

Management in Tehran consisted of dimercaprol 400 mg on day 1, 300 mg on day 2 and 200 mg on day 3. Sodium thiosulphate was given by injection. Prussian Blue(Hey?) was given in a dose of 3g on the first day, then 2g daily in 0.5g capsules. Vitamin B12 injections were given. Oral fluids were encouraged and fruit was given liberally as a source of potassium. Morphine and pentazocine were given as required for pain. He was also given treatment to remove thallium from his bloodstream (possibly haemodialysis).

Despite treatment, his condition deteriorated. His main clinical problem was a severe peripheral (motor) neuropathy, and he was transferred to London for further care on December 21, four weeks after the main episode of poisoning. His general condition was fair when first seen. He still had pains in the chest and abdomen and had shortness of breath when speaking. He also had great difficulty in sleeping at night. However, his bowels were functioning well.

## CLINICAL EXAMINATION

He was a cooperative patient, with a mild pyrexia. His head was shaven. There was slight loss of body hair, but loss of head hair was much less than in two other patients who were not shaven, who were transferred at the same time. Hair could however be easily removed by traction. The nails were normal when he was first seen, but he later developed transverse white lines, typical of thallium poisoning.

There was no significant lymphadenopathy, and no abnormality in the chest or cardiovascular system on examination. There was a scar from a previous operation (?partial gastrectomy) in the abdomen, and there was some abdominal tenderness.

Central nervous system: fundi normal, cranial nerves normal. Biceps and supinator jerks present and equal. Knee and ankle jerks and plantar reflexes could not be elicited. Diminished sensation over distal parts of both feet. Power in the legs was grossly reduced - the left leg could not be raised against gravity, the right leg could just be raised off the bed.

## INITIAL INVESTIGATIONS

Haemoglobin 14.0 g/dl

White cell count 11.8 x $10^9$/l (83% neutrophils)

ESR 68 mm/hour, later 107 mm/hour

Plasma urea, creatinine, electrolytes and liver function tests no significant abnormality. Protein electrophoresis no gammopathy.

Midstream urine - normal on microscopy, coliforms on culture

Chest x-ray - widespread opacities, suggestive of malignancy.

Electrocardiogram within normal limits.

Blood thallium 57 mg/l

Urine thallium 1880mg/l

PROGRESS PULMONARY LESIONS.

Since it was probable that he might have myeloma or lymphoma or widespread metastases from a carcinoma, he was subjected to numerous investigations, none of which revealed any cause for the radiological changes. He was finally given an open lung biopsy, which revealed that the opacities seen on x-ray were multiple abscesses. He was treated with high - dose intravenous cefuroxime for 3 weeks and the opacities disappeared: his pyrexia settled and his ESR returned to normal. The histology showed the features of a subacute abscess formation, with no bacteria or fungi seen. However, culture of the abscesses under aerobic and anaerobic conditions never revealed the organism. Mycobacterial bacterial cultures were also negative.Following the operation, he developed severe diarrhoea which was treated with oral vancomycin.

TREATMENT FOR THALLIUM POISONING

The regime given was Berlin blue (5g bd) , multivitamin tablets (BC500, Ayerst), and Slow K tablet (2 three times daily).

PROGRESS THALLIUM POISONING

As his main clinical problem (apart from the pulmonary lesions) was weakness due to peripheralneuropathy. He was given intensive physiotherapy, and made a steady improvement. He was able to walk with help in a few days and later was given exercises which included weight training, cycling and swimming, till he was fully mobile. A neurological opinion and nerve conduction studies in February 12 showed normal sensory action potentials and motor conduction velocities but there were signs of denervation in muscles of the lower limbs. The opinion of Professor Richard Hughes was that it would take 2 - 3 years for maximum recovery, and that he might still be left with some residual deficit. Clinically slowest improvement was in the right quadriceps muscle; the right knee jerk was the last to return.

During January, his hair started to re-grow, and he had few further complications. He complained of a dry mouth and was told that this was a recognised complication of thallium poisoning since the salivary glands are often affected. He also had an opthalmological opinion and was provided with spectacles, but this was unrelated to his thallium intoxication. However he had dry eyes, which were due to thallium toxicity, and was given hypromellose eye drops to use as required. He had diarrhoea for some time, which was probably due to his antibiotic therapy. No cause was found on investigation, and it settled.

G N Volans BSc MD FRCP
*Director*
J A Henry MB MRCP
*Consultant Physician*
V S G Murray MSc MFOM
*Hon Consultant Occupational Toxicologist*
R Widdop BSc PhD
*Consultant Biochemist*

**Lewisham and North Southwark Health Authority**

# Poisons Un

**New Cross Hospital**
Avonley Road London SE14 5ER
Telephone 01 407 7600

CASE SUMMARY

MUSTAFA MAHMOUD, AGED 41

DIAGNOSIS Thallium poisoning

Mr Mahmoud was admitted to London Bridge Hospital on December 21 1987, following thallium ingestion on at least two occasions. He developed chest pain after suspected poisoning with thallium on october 5 1987, but had no other symptoms. On another occasion on November 24, twelve people dined in a private house in Marge. Three of these people (including his mother, aged 65) died. One male had vomiting, cold sweating, lost vision and died within 3 hours. One female collapsed after 2 hours, vomited repeatedly and died four hours after the meal. His mother also had repeated vomiting and died after ten hours. None of the other people developed symptoms that day, but within 24-48 hours several people had numbness in the feet and hands, pains in the legs and difficulty in walking. Mr Mahmoud had stomach pains and severe vomiting, lost sensation in his toes and fingers and developed difficulty in breathing. Thallium poisoning was diagnosed and they were transfered to Tehran for treatment. This involved a six day journey by mule, so that no treatment was given for several days.

Management in Tehran consisted of dimercapol 400 mg on day 1, 300 mg on day 2 and 200 mg on day 3. Sodium thiosulphate was given by injection. Prussian Blue(Heyl) was given in a dose of 3g on the first day, then 2g daily in 0.5g capsules. Vitamin B12 injections were given. Oral fluids were encouraged and fruit was given liberally as a source of potassium. Morphine and pentazocine were given as required for pain. He was also given treatment to remove thallium from his bloodstream (possibly haemodialysis).

Despite treatment, his condition deteriorated. His main clinical problem was a severe peripheral (motor) neuropathy, and he was thansferred to London for further care on December 21, four weeks after the main episode of poisoning. His general condition was fair when first seen. He still had pains in the chest and abdomen and had shortness of breath when speaking. He also had great difficulty in sleeping at night. However, his bowels were functioning well.

# LONDON BRIDGE HOSPITAL

27 Tooley Street, London SE1 2PR. Tel 01-407 3100 Telex [illegible] LBHOSP G


31 December 1987

<u>To Whom it May Concern</u>

This is to state that Mustafa MAHMOUD, Adnan AL-MUFTI, Sami Fatah SHAWRASH, were admitted to the London Bridge Hospital suffering from the effects of acute thallium poisoning which occurred on 24.11.87 and all were seriously affected. Thalium is a heavy metal, most commonly used as a rat poison, and a small amount can be fatal.

All three are now in a stable condition and full recovery from the effects of the poisoning is anticipated.

[signature]

Dr J A Henry FRCP
Consultant Physician
<u>National Poisons Information Service</u>

JAH/JB

[illegible]


St. Martins Hospitals Ltd. Registered Office, Adelaide House, London Bridge, London EC4R 9HT Registered in England No. [illegible]